# سەرەتایەك لە

# واتاسازی لە ڕێزمانی کاردا

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

پرۆفیسۆر

د. شێرکۆ بابان

کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

هەولێر ٢٠١٧

منتدى إقرأ الثقافي

# سەرەتايەك لە

# واتاسازی لە رێزمانی کاردا

پرۆفیسۆر
د. شێرکۆ بابان
کۆلێژی ئەندازیاری زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر

هەولێر ٢٠١٧

منتدى إقرأ الثقافي

- ناوی کتێب:

**سەرەتایەك لە واتاسازی لە ڕێزمانی کاردا**

- ناوی نووسەر: پ. د. شـــێرکۆ بـــابـــان
- بابەت: ڕێزمانی کوردی
- دیزاین: دەزگای گۆڤار بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە (ماهر موعین مستەفا)
- چاپی یەکەم / ٢٠١٦
- چاپخانەی منارە – هەولێر (٠٧٥٠٤٤٥٦٢٩٧).

لـە بەڕێوەبەرایـەتی گشـتی کتێبخانـە گشـتییەکان/هەرێمی کوردسـتان، ژمـارەی سپاردنی (١٥١) ساڵی ٢٠١٧ ی پێدراوە


منتدى إقرأ الثقافي

# پێشەکی

بزافی واتاسازی لە بیری ئێمەدا هەر زاوزێ دەکات و لە هەر نموونەیەکدا چەندین بیرۆچکەی ورد یەکتری دەبڕن، بەڵام بە ئاسانی لە یەکتری جودا ناکرێنەوە، چونکە جەنگەڵستانی واتاسازی زۆر دژوار و تووناوتوونە. ڕەنگە تەمەن و تەندروستیش ڕێگای ئەوە نەدەن کە خزمەتی ئاستی (واتاسازی) بکەین، وەك چۆن خزمەتی هەردوو ئاستی (ڕێزمان) و (دەنگسازی)مان کردوە. لە ئەو دوو ئاستەی زمانەکەدا گەیشتووین بە ئاستی (تیۆریزەکردن). چونکە تیۆریمان داناوە و زمانەوانانی ڕۆژئاوایش هەڵیان سەنگاندوە و دەستی ڕێزیان لە سەرداناوە[1]. لە شیکاری ڕێزمانیدا، لە ساڵی (١٩٩٢)ەوە، تیۆری (پلیکانەی ڕستە) سەرمەشقە و سەردەقی هەموو ئیشەکانی شکاندوە و لە گشت جێیەك بەکار هێنراوە. لە شیکاری دەنگسازیدا، لە ساڵی (١٩٩٧)ەوە، تیۆری (زەبری بزوێن) سەرمەشقە، بەڵام لە ساڵی (٢٠١٣)ەوە یەکلاییکراوەتەوە و لە گشت جێیەکدا بوە بە وێردی سەر دەممان و لە گشت شرۆڤەکاریەکدا پیادەمان کردوە. لە ڕاستیدا، ڕەنگە پاشماوەی تەمەن مەودای ئەوە نەدات کە لە بواری (واتاسازی)دا ئەسپی خۆمان تاو بدەین، بە هەر حاڵ ئەم کتێبەی بەردەست لە پێش پتر لە (٢٠) ساڵ نووسراوەتەوە و لە ساڵی (٢٠٠٦-٢٠٠٧) کورتکراوەتەوە و زۆری لێ فڕێدراوە، ئەمجا لە کۆڕی زانیاری کوردستان لە لایەن چەند گەنجێکی خۆبەخشەوە تایپکراوە، بەڵام بڵاو نەکراوەتەوە. ئێستایش (٢٠١٦-٢٠١٧)، چەند جارێك پێداچوونەوەی بۆ کراوە و بە دەیان لاپەڕەی تری لێ قارسکراوە و ئەمجا نێردراوە بۆ چاپخانە بۆ بڵاوکردنەوە. داوای لێ بووردن دەکەین ئەگەر نەوەی نوێ ڕەخنەیان هەبێت، چونکە کاتەکە و تەمەنەکە هەر وا بەشیان کردوە و دەرفەتمان نەبوە کە وەك هەردوو ئاستی (ڕێزمان و دەنگسازی) بایەخی تەواو بدەین بە ئاستی (واتاسازی). لە رووی شرۆڤەکاریەوە، لە زمانی کوردیدا ژمارەی کارەکان کەمە، هەر لە بەر ئەو

[1] ئەو هەڵسەنگاندنانە چەندین جار بڵاوکراونەتەوە، چی لە گۆڤارەکاندا و چی لە کتێبەکاندا.



منتدى إقرأ الثقافي

سەدەمە هەرسێ بزاڤی (فرەواتایی, فرەڕوخساری, واتاخوازی) زۆر بـەرفراوان و کاریگـەرن و هەروا بە ئاسانی تەی ناکرێن. لە ئەم ڕوانگەیەوە، چەند جۆرێك لە میکانیزم هەیـە بـۆ واتادانەوە. یەکێك لە ئەو میکانیزمانە بریتیە لـە واتـاگۆڕین بـە (بـەرکاری ڕێزمـانی). بـۆ زانین، لـە زمانەکـەی ئێمـەدا (بنـەمای ئاوێنـە) دەچەسـپێت و وێنـەی کۆلکـەی (بـەرکار) و هەندێك لە فۆرفیمەکانی کار لە ئاستی (ڕستەسـازی)یەوە دەگوێزرێتـەوە بـۆ نێـو ئاوێنـەی (وشەسازی). بۆ نموونە بەرکاری (نان) لە ڕستەی (شـیلان نـان دەخـوات)دا دەگوێزرێتـەوە بـۆ ئـەو وشـانەی کـە ئـەو ڕسـتەیەوە وەر دەگیرێـن، وەك (نـانخواردن، نـانخۆر، نـانخوراو، نـانخواردوو, ...). واتـە، ڕەگـەزی (بـەرکار) خـۆی دەکـات بـە (واتـا بەسـت) بـۆ گشت کـاری تێپەڕی زمانەکە، بـەڵام لـە هەنـدێك کـاردا ئـەو بـەرکارە واتابەسـتە دەبێـت بـە (بـەرکاری واتـاگۆڕ)، چـونکە واتـای (بـەرکار) هـەرس دەبێـت لـە واتـای ئـەو کـارەدا، کـە لـە (کـاری یاریدەدەر) دەچێت. لە ئەم هەڵوێستەدا، تایبەتکاری پەیدا دەبێت، چونکە ڕووداوی پتەوی کارەکە دەبەسترێت بە ئەو سیما واتاسـازیانەوە کـە کۆلکـەی (بـەرکار) هـەڵی دەگرێـت. بـە واتایـەکی تـر، هەنـدێك لـە کارەکـان، وەك (خـەم حـواردن، سـوێند خـواردن، هـەنگاو نـان, هەناسە دان، پشوو دان، دەنگ دان، هەنیسك دان، درز بردن، شەق بردن، بەرگە گرتن، مـان گرتن، ڕێزگرتن، کەف کردن، هەڵم کـردن، سـۆز کـردن، هەسـت کـردن، ئـیش کـردن، هـاوار کردن، ...) دەبن بە جۆرێك لە (کاری یاریدەری واتاسازیانە)، چونکە خانـەی (بـەرکار) واڵا دەکەن بۆ هەندێك لە (بەرکاری واتاگۆڕ). لە ئەو جۆرە کارەدا تەوەری (واتاسازی) لە سـەر واتای کۆلکەی (بەرکار) دەگەڕێت، بەڵام تەوەری (ڕستەسازی) لـە (کار)ەکـەوە دەخوازرێـت. بـۆ نموونـە، لـە کـاری (هەناسـەدان)دا واتـای بـەرکاری (هەناسـە) تـەوەری (واتاسـازی) دابەستوە، بەڵام کاری (دان) تـەوەری (ڕستەسـازی) بـۆ خسـتوەتە کـار. یـان، لـە کـاری (نـان خواردن)دا، واتای بەرکاری (نان) فراوان بوەتـەوە و واتایـەکی تـازەی داهێنـاوە بـۆ (هـەموو جۆرەکانی خواردەمەنی), تەنانەت ئەگەر ئەو خواردەمەنیە ماکی (نان)یشی تێـدا نـەبێت. ئەگەرنا، واتای کاری (خواردن) بنجیە و نـەگۆڕاوە، بـەڵام واتـای خـوازراوی وشـەی (نـان)ی وەك هەر بەرکارێکی (واتا-فراوان) وەرگرتوە. بە کورتی، کەسانی بلیمەت و زیتەڵ دەتوانن



منتدى إقرأ الثقافي

بە ئاسانی تێ بگەن لە ئەو ڕاستیەی كە: ئەو میكانیزمە واتاسازیانەیەی كە لە كاری (هەناسەدان)دا چەسپاوە زۆر جیاوازە لە ئەو میكانیزمەی كە لە كاری (نان خواردن)دا چەسپاوە. یان ئەو میكانیزمەی كە لە كاری (هەنا سەدان)دا هەیە زۆر جیاوازە لە ئەو میكانیزمەی كە لە كاری (پارە دان)دا هەیە. تەنانەت، لە هەندێك كاردا، (ئەنجامی ڕووداو) واتای خوازراو دا دەهێنێت، وەك (ملی شكا) بە واتای (مرد)، یان لە هەندێك كاری تردا (پەیامی ڕووداو) واتای تازە دا دەهێنێت، وەك (دەستی گرت) بە واتای (یارمەتی دا). لە ئەم ڕوانگەیەوە، بە تەریبی لە گەڵ ئەم كتێبەی بەردەستدا، توێژەرانی زرنگ و بلیمەت دەتوانن دوو كتێبی تر بخوێننەوە: (ڕێزمانی كاری ناسادە، كاری دارێژراو و كاری لێكدراو/ ٢٠١٤) و (گەشتێك بە نێو ڕێزمانی كاردا/ ٢٠١٦). بە ڕاستی، لە ڕۆژگاری ئێمەدا، وەك مامۆستا گۆران دەڵێت: بەهرەی پیاوی بەهرەدار وەك تۆوی گوڵی دەمبا وایە و لە سەر بەردی ڕەق دەڕوێت. كەواتە، لە گەڵ گشت ئەو شەرئێشە و دەردەسەریانەدا كە لە ڕێگادان، هەر باشە لە سەر (بەردی ڕەق) ئەوەندەیشی لێ سەوز بوە و هاتوەتە بەرهەم و گەیشتوەتە دەستی ئەوەی دواڕۆژ. داوای لێ بوردن دەكەین لە هەر كەم و كوورپەكی ڕووكەشی یان بنكەشی. بە كوردی، گرنگ ئەوەیە كە تشتێكی نوێ بخەینە نێو ئەتڵەسی ڕێزمانی كوردی، بە ڕاستی، ئاستی واتاسازی زۆر ئاڵۆزە لە زمانی كوردیدا، بەڵام زۆریش بێخزمەتە.و دەشێت ئەوەی نوێ چەند ناوەندێكی توێژینەوەی بۆ دابمەزرێنن لە زانكۆكاندا.



منتدى إقرأ الثقافي

## ناوەڕۆك





منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي

منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی یەکەم
## ڕوومالێکی بەرفراوان بە بزاڤی واتاسازیدا

**١/١: سەرەتایەك:**

لە ئەو ئیشانەدا کە ئێمە لە سەری دەنووسین، هەر لە سەرەتاوە ڕێزمانی کار بریتی بوە لە کێشە گەورەکان. هەر لە بەر ئەوە، ئێمە چەندین کتێب و لێکۆڵینەوەمان لە سەری نووسیوە و بڵاو کردوەتەوە. بێگومان، بابەتی (کار) لە ڕێزمانی کوردیدا زۆر ئاڵۆزە، چی لە ڕووی مۆرفۆلۆژیەوە، چی لە ڕووی سینتاکسەوە، چی لە ڕووی واتاسازیەوە. لە لایەکی ترەوە، دەگوترێت[٢]: مژاری (واتا) زۆر لێڵ و نەگیر و ئاوێتەیە. کە ناشێت بتوانرێت پێناسەیەکی ڕوون و بەرجەستە و دەستگیری بۆ بکرێت. سەرەڕای ئەوانە، ڕێزمانی (کار) زۆر زۆر چڕ و جیڕ و ئەستورە لە ڕووی واتاسازییەوە. واتە، واتاسازی (کار) بریتیە لە جەنگەڵستانێکی تاریك و پێچاوپێچ، کە پێویست بە نەخشەسازی و بە ڕووناکی لێکۆڵینەوە دەکات، چونکە هەر کارێك بەپێی هەنگاوی ڕۆژگار واتا دەداتەوە و ئەو دیاردەیەیش بە چەندین ڕێچکەدا بڵاودەبێتەوە و چەندین میکانیزمی ئاڵۆز دەگرێتە خۆی. لەپاشتردا، چەندین واتا لە ناو دەچن و چەندینی دی جارێکی دی دەبووژێنەوە. لە ڕاستیدا، میکانیزمەکان زۆر زۆر تێکەڵهەڵکێش دەبن و هەندێك لە ئەڵقەکانی زنجیرەی واتاکە وندا دەبن. لەگەڵ ئەوەیشدا، چەندین واتای خوازراو بە ئەنجام و بە پەیامی بە سەرهات لە دایك دەبن. لە بەر ئەو هۆیانە، زۆر بە وردی دادەبەزینە نێو بابەتەکە و بە ئەو هیوایەی بتوانین برێك لە تەم ومژەکەی برەوێنینەوە. هەر چەندە، ئێمە دەزانین کە بابەتەکە زۆر ئەستوور و تێکچڕژاوە و ئەم کتێبە ناتوانێت بە تەواوی گەمارۆی بدات، بەڵام هەر هیچ نەبێت بیر و بۆچوونەکان تۆمار دەکەین و سەرەتایەکی تر دادەنێین بۆ لێکۆڵینەوە لە ئەو بوارەدا. ئەگەر دەرفەتیش برەخسێت و تەمەن بوار بدات، لە داهاتوودا چەندین نووسینی دیکەی لە سەر بڵاو دەکەینەوە.

---

[٢] بڕوانە بۆ سەرچاوەی (Hurford & Housley, PP 1).



منتدى إقرأ الثقافي

**٢/١: کێشەکانی واتاسازی:**

بـە بـەراورد لـە گـەڵ ئاسـتەکانی زمانەوانیـدا، واتاسـازی زۆر بـێ خزمەتـە لـە زمانەکـەی ئێمـەدا و ئـەم دیاردەیـەیش زۆر کێشـەی دروسـت کـردوە. بـۆ نموونـە، لـە وەرگێڕاندا هەست بە دژواری دەکەین و وا تێ دەگەین کە زمانەکە کورت دەهێنێت. لە ڕاستیدا، نە زمانەکە کورت دەهێنێت نـە خۆیشمان بـێ بـەهرەین لە وەرگێڕانـدا، لەگەڵ ئەوەیشدا، هۆی ئەو دژواری و پەیتیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەم خاڵانەی خوارەوە:

**یەکەم:** نەشارەزاییمان لە ڕێزمانی کوردیدا، کە بـوە بـە هـۆی کلۆمبـوونی بیرمـان. لـە ئـەم کێشەیەدا زۆر جار وەرگێڕەکە زمانی بابەتەکە بە ڕێزمان دەزانێت، بەڵام زمانەکەی خـۆی نازانێت (بە ڕێزمان). ئەوەیش وا دەکات کە هەر بە ڕێزمانی زمانی بابەتەکە بیر بکاتەوە، بەڵام لە زمانەکەی خۆیدا بە زمانی ژیری بیر دەکاتەوە.

**دووەم:** زۆر جار لە وەرگێڕاندا واتای بنجی لە زمانی بابەتەکەدا دەچێتە بەرانبەر واتایەکی خـوازراو، یـان بـە پێچـەوانەوە. لـە ئـەم هەڵوێستەیشـدا، ئەگـەر وەرگێڕەکـە واتاسـازی نەخوێندبێت و هەرسی نەکردبێت لە هەر دوو زمانەکەدا ناتوانێت بە شێوازێکی تۆکمـە و کاریگەر وەرگێڕانەکەی خۆی ئەنجام بدات.

**سێیەم:** لە ئەو زمانانەوە کە زۆر خزمەتکراون بـە ڕێزمـان، ئـەرکی وەرگێـڕان زۆر دژوارە، چونکە زمانی شیری دادی وەرگێڕان نادات بە جوانی. واتە، زمـانی خزمـەتکراو دەبێـت بـە زمانی خزمەتکراو بخرێتە بەر وەرگێڕان، تا کاریگەری وەرگێڕانەکە دەر بکەوێت.

**چوارەم:** بە بەراورد لە گەڵ زمانانی دیدا، لە زمانەکـەی ئێمـەدا ڕێزمـانی کـار زۆر ئـاڵۆزە. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستیەی کـە کـاری بنجـی لـە زمـانی کـوردی زۆر کەمـە بـە ژمارە ونەو ژمـارە کەمـە بـە میکانیزمـەکانی واتاسـازی دەگـات بـە شـەقاوی زمانـانی دیـدا، وەك: ئنگلیزی (٦٠٠٠) کار، فەرەنسی (١٢٠٠٠) کـار، ئـەڵمانی و ئیتـاڵی (٨٠٠٠) کـار[٢]. کەواتـە، دەشێت لە زمانەکەی ئێمەدا، بێشەی واتاسازی زۆر زۆر چـڕ و تاریـك و توونـاوتوونتر بێـت لە هی ئەو زمانانە.

---

[٢] وەك لە ئەم سەرچاوانەدا دیاریکراوە: (Le nouveau Bescherelle) و (Quenelle & Hourquin).



منتدى إقرأ الثقافي

**پێنجەم:** لە فێربوونی زماندا، یەکەم جار واتا بنجیە پتەوەکان فێر دەبین و لە پاشتردا واتا سەربارەکان فێر دەبین. هەر لەبەر ئەوە، ئەگەر کەسێك بە گەورەیی زمانی کوردی فێر ببێت، ئەوا ڕوو دەکات لە بێشەیەکی چڕ لە (واتای خوازراو) و لە (واتای سەربار). لە ئەم هەلۆێستەدا، چەندێك میكانیزمی واتاوانەوە ئالۆز و پتەو بێت، ئەوهەندە ئەو كەسە تووشی سەرئێشە دەبێت. لە ڕاستیدا، بەرانبەرکردنی دوو واتای بنجی لە دوو زماندا زۆر زۆر ئاسانترە لە بەرانبەرکردنی واتایەکی بنجی و واتایەکی خوازراو، یان واتایەکی خوازراو و واتایەکی خوازراوی دی.

**شەشەم:** وەرگێڕی ڕاستەقینەی زمانی کوردی دەبێت شارەزابێت لە خەسڵەتە تایبەتیەکانی زمان و ڕێزمانی کوردی، ئەو خەسڵەتانەی کە جودای دەکەنەوە لە زمانی بەرانبەر. لە سەر پێوانەی هەندێك سەرچاوە[4]، زمانی کوردی لە جۆرە سیستمی (ئێرگەیتیف)ە، یان لە جۆری بکەربەزێنە (پرۆدرۆپ)، یان ڕستەی زمانی کوردی ملکەچە بۆ ڕیزبەندی (بکەر – بەرکار -.کار)، یان زمانەکەمان لە جۆری زمانی نووسەکیە، یان هەر خەسڵەتێکی تر[5]. بە ڕاستی، شارەزابوون لە ئەو جۆرە زانیاریە مۆرکاویانەدا، لە هەردوو زمانی بەرمەبەستدا، پێگەی وەرگێڕ پتەوتر دەکات.

هەفتەم: لە ئەو بابەتانەدا کە بۆ (بژاردە)یەك لە خوێنەران وەر دەگێڕدرێن، پێویستە وەرگێڕەکە پسپۆڕ بێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بە سەرپاکیەوە کرۆکی بابەتەکە لە دانەرەوە بگوێزێتەوە، چی بۆ خوێنەر، چی بۆ توێژەر.

هەر لەبەر ئەوە، بۆ ئەم زمانەی ئێمە، کە زۆر سەنگین و ڕەنگینە لە ئاستی واتای نابنجیدا، زۆر زۆر پێویستە کە بایەخ بدرێت بە ئاستی (واتاسازی) و بە ئەو تیۆری و میکانیزمانەی کە لە تاریکی ئەو جەنگەڵە تێکچڕژاوەدا دەتوانن توولەرێ باریکەکان بدۆزنەوە.

---

[4] بڕوانە بۆ (pp 177- 183،Tallerman)، یان (pp 92-94.Leider).

[5] بڕوانە بۆ کتێبی (گەشتێك بە کرۆکی ڕێزمانی کوردیدا/٢٠١٦). لە بەشی چوارەمدا، ڕوومالێکی بەرفراوان و تێر و تەسەل پێشکەشکراوە لە سەر خەسڵەتە تایبەتیەکانی زمانی کوردی.



منتدى إقرأ الثقافي

**۳/۱: جۆرەکانی واتا:**

دکتور ئەحمەد موختار عومەر، پێنج جۆر لە واتای ڕیز کردوە، وەك:

**یەکەم: واتای بنچینەیی:** یان واتای بنجی، یان واتای سەرەتایی، یان واتای ناوەندی، یان واتای ڕاستەقینە و ڕووداوگێڕ، یان واتای هەست پێ کراو. لە ئەم نووسینەدا، ئێمە ئەم جۆرە واتایە بە (واتای بنجی) دەناسین و دەڵێین ئەو واتا بنجیە بریتیە لە (گلێنەی واتایی) بۆ میکانیزمەکانی واتادانەوە.

**دوەم: واتای سەربار:** یان واتای لاوەکی، یان واتای دوەم، یان واتای ناوەکی. لە نووسینەکانی ئێمەدا و لە ئەم نووسینەدا، ئێمە هەموو جۆرە واتا نابنجیەکان کۆ دەکەینەوە لە ژێر ناوی (واتای سەربار)دا. لە ئەم هەلوێستەدا، دەتوانین سێ زاراوە هەڵبژێرین بۆ ئەو واتایانەی کە بە میکانیزمەکانی واتادانەوە پەیدا دەبن، وەك:

(۱): واتای لاوەکی: بۆ ئەو واتایانەی لە میکانیزمی (فرەواتایی)دا پەیدا دەبن. بێگومان، ئەو واتایانە ڕووداوی ڕاستەقینەی کارەکە دەپارێزن. ئەمەیش لە هەردوو بەشی (دوەم و شەشەم)دا باس دەکرێت.

(۲): واتای فرەروخساری. بۆ ئەو کارانەی کە میکانیزمی ڕوخسار گۆڕین (فرەروخساری)، واتایان دەگۆڕێت کە واتایەکی بنجی تازەیە. ئەمەیش لە هەردوو بەشی (سێیەم و چوارەم)دا باس دەکرێت.

(۳): واتای خوازراو و واتای ئیدیۆم، بۆ ئەو واتایانەی کە بە میکانیزمی (واتا خوازی) پەیدا دەبن و ڕووداوی ڕاستەقینەی کارەکە فڕێ دەدەن. ئەم جۆرە واتایە لە بەشی (پێنجەم)دا باس دەکرێت.

**سێیەم: واتای دەروونی:** ئەم جۆرە واتایە لە هەندێك کاردا هەیە، کە واتادانەوەیەکی تایبەتی تێدایە لە دەروونی کەسی بەرمەبەستدا. بۆ نموونە، بەرهەمی نووسەرێك هەندێك واتادانەوە هەڵ دەگرێت لە خودی نووسەرەکەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

چوارەم: واتای شێوازگر: لە ئەم جۆرە واتایەدا كاریگەری بارودۆخی كۆمەڵایەتی و جوگرافی هەیە. بۆ نموونە، كەسێكی بازاڕی لە هەندێك واتا تێ دەگات كە كەسانی ڕۆشنبیر تێ ناگەن، یان بە پێچەوانەوە.

**پێنجەم: واتای رەنگدانەوە (الايحاء):** هەندێك بێژە هەیە كە خۆی لە خۆیدا پەیامی واتایی هەڵ دەگرێت، وەك (میاواندن، جوكاندن، زریكاندن، وەڕین). ئەم جۆرە دەنگانە زمانێكی تایبەتیان نیە و گشتین. سەبارەت بە ناوەڕۆكی ئەم نووسینە، ئێمە بایەخ بە جۆری واتای (بنجی) و (نابنجی) دەدەین. ئەمەش لە بەشەكانی داهاتوودا شلۆڤە دەكرێت.

**٤/١: ڕێبازەكانی لێكدانەوەی واتا:**

بەپێی ئەو سەرچاوانەی كە لە بەر دەستدان، پێنج جۆری سەرەكی لە ڕێبازی لێكدانەوەی واتایی هەیە، وەك:

**یەكەم: بیردۆزەی ڕێبازی نیشانەیی (Referential Theory):** ئەم بیردۆزەیە لە سەر سێ خاڵی بنچینەیی ڕۆنراوە و ئەو سێ خاڵەیش سێ گۆشەیەك، یان سێكوچكەیەك، پێك دەهێنن، وەك نەخشەی (١/١):




نەخشەی (١/١): تیۆری ڕێبازی ئاماژەیی

لە ئەم بیردۆزەیەدا، كە زۆر گشتیە بۆ هەموو زمانەكان، چاوی مرۆڤ نیشانەیەك (كورسی) دەبینێت و بیریش دەی كات بە (بیرۆكە). پاشان، لە بیردا بیرۆكەكە دەكرێت بە



منتدى إقرأ الثقافي

هێما (كورسی) بە پێی زمانی ژێری، یان ئەو زمانانەی كە بینەرەكە پێی دەئاخڤێت. لە ئەو سێگۆشـەیەدا، هێڵی (لای ڕاست) گشتیە بـۆ هـەموو مـرۆڤ، بـەڵام هێڵی (لای چـەپ) تایبەتە بە زمانی ژێری، یان بە ئەو زمانانەی كە بینەرەكە دەی زانێت بـە تـەریبی لەگـەڵ زمانی ژێریدا. بۆ نموونە، منداڵی كورد كە وێنەكە دبینێت بە چاو یەكسەر بیری دەچێت بۆ ناوی (كورسی) و دەی دركێنێت. لە بەرانبەردا، هێڵی (لای خوارەوە) هیچ پەیوەندیـەك دیاری ناكات، چونكە هەر زمانێك بە جۆرێك ناو لە ئەو كورسیە دەنێت.

**دوەم: بیردۆزەی ڕێبازی بیرۆكەیی (Idiational Theory):**

یـــان، بـــیردۆزەی وێنـــەیی (Image Theory)، یـــان بـــیردۆزەی ژێـــری ( Mentalistic Theory). لە ئەم بیردۆزەیەدا، بە كار هێنانی (وشە) دەبێت ببێت بـە ئامازەیـەكی هەسـتیاوەری بـۆ بیرۆكـە و ئـەو بیرۆكەیـەیش كـە دەی نوێنێـت، واتاكـەی دەبەخشێت.

**سێیەم: بیردۆزەی ڕێبازی ڕەفتاری (Behavioural Theoy):**

لە ئەم بیردۆزەیەدا، هەستی دەروونی بەكار دەهێنرێت، وەك دەگوترێت:

شیلان برسی بوو و سێوەكەی بینی. برسێتی شـیلان و بینـینی سـێوەكە بـوون بـە (هۆكار). لە جیاتی ئەوەی شیلان بە ڕاستەوخۆیی دەسـت ببـات بـۆ سـێوەكە و دای بگرێـت بە خـۆی، بـە گۆكردنی (وشـە) سێوەكەی داوا كـرد. ئـەو وشـانەی كـە گـۆ كـران بـوون بـە (هۆكار) بۆ ئازاد بۆ ئەوەی كردەوەیەك بنوێنێت، كە لە ئەوە بچێت، كە خـۆی هەسـتی بـە برسێتی كردبێت و دەستی بردبێت بۆ سێوەكە.

**چوارەم: ڕێبازی سیاقی، یان ڕێبازی ڕەوتی گوفتار ( Contextual Theory):**

لە ئەم بیردۆزەیەدا، واتای وشە بـە ڕەوتـی گوفتـار دیـاری دەكرێـت. واتـە، وشـەكە هـەتا نەكەوێتـە ڕیـزەوە و لـە گوفتـاردا بـەكار نـەهێنرێت، ئـەوا واتـای تـەواوی خـۆی دەرناخات. بۆ نموونە، وشـەی (نـاو) واتـای تـەواوی خـۆی دەرناخـات و دیـاری ناكـات، هـەتا نەگوترێت: {كەس لە ئەم (ناو)ە نیە}، بە واتای (كەس لە ئەم شوێنە نیە).



منتدى إقرأ الثقافي

**پێنجەم: ڕێبازی شیتەڵكاری:**

بە بۆچوونی ئێمـە، ئـەم بیردۆزەیـە زۆر كاریگـەرە و لـە ئـەوانی دی چالاكترە بـۆ لێكدانـەوەی (واتا). واتە، ئەم ڕێبازە لەگەڵ پێشكەوتنی زمانەوانیدا دەگونجێت، بە تایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. لـە ڕاسـتیدا، جۆرە ڕێبـازی ئاوهـا كـە لـە (تاكـە وشـە) بكۆڵێتەوە، كاریگەری خۆی دەردەخات بۆ دیاری كردنی واتاكان و بۆ وەرگێڕانیان لە نێـوان زمانانەكاندا. بێگومان، ئەگەر وشەیەك هەڵگری چەند واتایەك بێت، ئەوا بە شرۆڤە و بـە شیكار هەموو پێكهاتەكانی لە یەكتری جودا دەبنەوە و لە هەر جودا بوونەوەیەكدا دوو لـق پەیدا دەبن و دوو سەرەتا بۆ دوو جەمسەری واتـایی دەردەكـەون و لێـك دوور دەكەونـەوە. بۆ نموونە، ئەگەر كاری (بـڕین) لـە (دەسـت بـڕین، جـەرگ بـڕین، پـرچ بـڕین، جـل بـڕین، خشـت بـڕین، سـەر بـڕین، نـان بـڕین...)دا شـلۆڤە بكەینــەوە، دەبیـنین كـە لـە بزاڤـی واتادانەوەی كاری (بڕین)دا چـەندین واتـای سـەربار پەیـدا دەبـن. لـە ئـەم ڕوانگەیـەوە، لـە بەشەكانی داهاتوودا ڕوو دەكەین لە كارەكانی زمانـەكـە و تـا بتـوانین گڵۆڵـە ئاڵۆسـكاوەكانی واتاسازی خاو دەكەینەوە و ئەمجا بە پێی توانا تیۆریزەیان دەكەین.

**١/٥: مەودای واتای كار:**

ئەگەر ئەختێك ڕابمێنین لە ئاستی واتای كار، دەبیـنین كـە هـەر كارێـك واتایـەكی (بنجی) هەیە، ئەو واتایەیش سەخت و پتەوە. بۆ نموونە، كاری (شكان)، وەك:

بەردەكە شكا، من شووشەكەم شكاند

لە ئێرەدا، كـاری (شـكان) چـەند سـیمایەك هـەڵ دەگرێـت و ئـەو سـیمایانە بۆیـان هەیە ڕووداوێكی ڤیدیۆیی بخەنە بەرچاو. واتە، (بەرد و شووشە) لە ئەو دوو نموونەیـەدا، دوو مادەی ڕەق و ناسكن و دەتـوانن ڕووداوی كـاری (شـكان) پیشـان بـدەن، ئەگـەر بكەونـە بـەر هێزێكـی میكـانیكی. لـە گـەڵ ئەوەیشـدا، دەشـێت كـاری (شـكان) چـەندین واتـای دی



منتدى إقرأ الثقافي

ببەخشێت. بێگومان، ئەگەر (واتای بنجی) لە كاری (شكان)دا بریتی بێت لە واتای بنچینەیی و ڕاستەقینە و پتەو، ئەوا ئەو واتایانەی دی بریتین لە (واتای سەربار). لە ڕاستیدا، ئەو واتا سەربارانە، بۆیان هەیە بە زەبری ڕۆژگار پەیدا ببن و لە ژێرەمۆی پێشیناندا خەزن بكرێن، پاشان لە زاراوەی تەكنەلۆژیای تازەدا بە كاربهێنرێن. بۆ نموونە، دەگوترێت: (مل شكان، چاو شكان، دڵ شكان، قسە شكان). لە (مل شكان)دا، ڕووداوی (مل شكان)ی كەسێك بوە بە (پەند)، چونكە ئەوەی ملی بشكێت لە ژیان بێبەری دەبێت و دەمرێت. لە پاشتردا، (مل شكاندن) پەیدا بوە و لە پاش ئەمەیش، دیاردەی (مل شكان) بوە بە جوێنێكی سپی، وەك دەگوترێت: (ئەو ملشكاوە نەهات)، یان: (دەك ملی بشكێت). واتە، پێكهێنەری ئەو ڕستەیە بە جوێنێكی سپی نیازی خۆی دەرخستوە بەرانبەر بە كەسێك كە هیوای مەرگی بۆ دەخوازێت و ئەو هیوا ڕەشە لە گفتەكەیدا بە راشكاوی خراوەتە ڕوو. ئەمە و واتای كاری (شكان) بە چەشنێك هەڵ سوورێنراوە كە جێی زۆربەی زۆری بیردۆزەكان و میكانیزمەكان واتاسازی دەكاتەوە. سەرەڕای ئەوەیش، هێشتا (چاو شكاندن، دڵشكاندن، قسەشكاندن، لووت شكاندن، پۆت شكاندن، ...) ماوە. بێگومان، لە دوو توێی ئەم نووسینەدا، ڕوو دەكەین لە ئەو واتایانە، بە ئەو هیوایەی بتوانین چەند هەنگاوێكی هورد و زرنگ بكەینەوە لە ئەو جەنگەڵە كوناوكون و پێچاوپێچەدا.

**٦/١: فرە واتایی لە ڕێزمانی كاردا:**

ئەگەر لە بانێژەی واتاسازیەوە ڕوو بكەین لە وشەكانی زمانەكە، دەبینین كە دابەش دەبن بە سەر سێ خێزاندا، وەك:

**خێزانی یەكەم:** ئەم خێزانە ئەو وشانە دەگرێتەوە كە یەك ڕوخساریان هەیە و لە هەمان كاتدا یەك واتا دەبەخشن. لە ئەم ڕوانگەیەوە، دەتوانین ئەم جۆرە نموونانە ناو بنێین (وشەی درشت)، واتە وشەی ڕوون و دیار، كە هیچ تەم و مژێكی واتایی هەڵ ناگرن، بەڵام ڕۆژانە واتا دەدەنەوە. واتە، ئەوەی ئەمڕۆ یەك ڕوخسار و یەك واتای هەیە، دەشێت لە ژێر بەرداشی ڕۆژگاردا چەندین واتای دی بداتەوە. بۆ نموونە، وشەی (بەرد)، لە ئەم



منتدى إقرأ الثقافي

خێزانەیە، بەڵام لە چەندین واتای تردا ڕەنگی داوەتەوە، وەك: (هەر كە منی بینی بوو بە بەرد، بەردەچەرخ، شیلان تووڕەیە و بەرد دەهاڕێت، )

**خێزانی دوەم:** خێزانی وشە هاوبێژەكان ( Polysemy) واتە، ئەو وشانەی كە یەك گۆكردنیان هەیە بەڵام پتر لە واتایەك دەبەخشن. لە زمانی كوردی و بە تایبەتی لە ڕێزمانی كاردا ئەم كێشەیە زۆر چڕ و پڕە و جیڕە، بە تایبەتی لە ئەو هەڵوێستەدا، كە واتاكان زۆر لە یەكتریەوە نزیكن و هەر هەموویان وەچە و نەوەی یەك واتای بنجین. بۆ نموونە، واتای بنجی كاری (گرتن)، چەند واتایەك دەداتەوە و هەر هەموو واتاكان مۆركی خزمایەتییان پێوە دیارە[٦].

**خێزانی سێیەم:** خێزانی وشە هاواتاكان ( Homonemy). واتە، ئەو وشانەی كە دوو گۆكردنیان هەیە بەڵام یەك واتایان هەیە. لە زمانی كوردی ئەم دیاردەیە زۆر بەربڵاو نیە و كێشەی زۆر كەمە لە ڕێزمانی (كار)دا. بۆ نموونە، كاری (خەوتن) و (نوستن) هەیە بۆ هەمان واتا. یان، كاری (خستن) و كاری (كەواندن) هەیە بۆ هەمان واتا، یان، كاری (ڕووخان) و كاری (ڕمان) هەیە بۆ هەمان واتا. بە هەمان شێوە (دیتن و بینین) و (ڕوانین و نواڕین) هەیە. لە ڕاستیدا، ئەم جۆرە نموونانە، زۆر بەرچاوین و دەشێت نموونەی دی هەبێت.

**٧/١: یەكەی واتاسازی:**

لەلایەن (پالمەر)ەوە، یەكەی واتاسازی (Semantic unit) بریتیە لە (وشە). پاشان بە ڕەخنەوە بۆی دەروات و دادەكۆشێت لە سەر (ڕستە) بۆ ئەوەی بكرێت بە دانەی واتاسازی. دكتۆر أحمد مختار عمر بۆچوونەكەی (نیدا)ی پیشانداوە، كە تێیدا خانەی واتاسازی بە گەورەتر و بچووكتر لە (وشە) ناسراوە، وەك:

(فرێز) > (وشە) > (مۆرفیمی لكاو) > (مۆرفیمی جودا)

---

[٦] بۆ زانین، هەردوو بەشی (هەفتەم و هەشتەم) لە ئەم كتێبە تەرخانكراون بۆ واتا و واتادانەوەی هەردوو كاری (گرتن) و (گرتنەوە).



منتدى إقرأ الثقافي

سەبارەت بە (کار)، کە خۆی وشەیە، ئێمە دەکەوینە نێو مێرگی وشـە و گـەورەتر لە وشە (فرێز)، هەرچەندە مژاری (کار) دەتوانێت مۆرفیمی واتاگۆڕ هـەڵ بگرێـت. ئـەوەی شـایانی باسـکردنە، خانـەی بنجـی کـار بریتیـە لـە (بچووکترین خانـەی واتابـەخش) لـە گەردانـنامەی کاردا. دەربارەی دیاریکردنی خانەی ئاوها چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم:** کاری زمانەکە، ئەگەر بە ڕووتی گۆکران، یان نووسران، ئـەوا دەچـنەوە سـەر واتـای بنجی (پەتی)، وەك:

بڕین: بڕین بە نامێری بڕین، وەك (چەقۆ، کێرد، تەور، داس، تەورداس، ...)

**گرتن:** گرتن بە دەست و پەنجە

**سووتان:** سووتان بە ئاگر و بوون بە سووتوو

**فرۆشتن:** فرۆشتنی تشتێك بە پارە

**دووەم:** کاری داڕێژراو، واتە هەر ڕوخسارێکی تازەی کار، بە شێوەیەك لە شێوەکان، واتایەکی تازە دا بهێنێت، وەك: (**هەڵ گرتن**: بار هەڵ گرتن)، یان: (**دا خستن**: قفل دان).

**سێیەم:** کاری لێکدراو لە چەشنی (بەرکار + کار) یان (بکـەر + کـار) واتاکـەی لـە ئـەلبوومی واتادانەوەدا دیاری دەکرێت، وەك: (**جێ گرتن**: تەرخان کردن)، (**دەست بڕین**: خەڵەتانـدن، خەپاندن)، (**چاو شکان**: ترسان).

**چوارەم:** زۆر جار کـاری لێکـدراو لـە چەشـنی (بـەرکار + کـار)، باسـکراو لـە خـاڵی پێشـتردا، بەرکارەکـەی لـە گـۆکردن دەبەخشـرێت لـە بـەر (سـەلاری گفـت و گـۆ)، بـەڵام کارەکـە دەترازێنێـت لـە واتـا بنجیەکـەی، باسـکراو لـە خـاڵی یەکەمـدا، وەك: (خواردنـەوە: (خواردنەوەی شلی سەرخۆشکەر). ئەم دیاردە واتاسازیە، هەڵ و مەرجی خاڵی یەکەم تێك دەدات.



منتدى إقرأ الثقافي

**پێنجەم:** زۆر جار واتای كاری لێكدراو (بەركار + كار) لە گەڵ واتای ئیدیۆمیدا یەك دەگرن تەم و مژ دروست دەكەن، وەك:

| واتای بنجی | واتای ئیدیۆم |
| --- | --- |
| شیلان (شەكر) دەشكێنێت بە | ئازادی گەمژە (شەكر)ی شكاند |
| شەكر شكێن | (قسەی بێ سەروبەری كرد) |

بە پێی ئەو خاڵانەی سەرەوە، دەگەڕێینەوە سەر بۆچوونەكەی (پالمەر) و ڕستە بە (یەكەی واتاسازی) دەناسین، چونكە:

- خاڵی یەكەم كورت دەهێنێت بەرانبەر بە خاڵی چوارەم. پاشان، خاڵی یەكەم ناتوانێت (واتادانەوە) دیاری بكات وەك خاڵی سێیەم.
- خاڵی دوەم كورت دەهێنێت بەرانبەر بە خاڵی سێیەم بۆ دیاری كردنی واتا.
- پاشان، خاڵی پێنجەم كورت دەهێنێت بەرانبەر بە جودا كردنەوەی دوو واتا.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێت كە (ڕستە) ئەندازە و پێوانەیە بۆ دابڕین و خانەخانەكردنی واتا جیاوازەكان لە یەكلاییكردنەوەی (یەكەی واتاسازی)دا.

**٨/١: واتادانەوە و ڕۆژگار:**

دكتور أحمد مختار عمر، هۆیەكانی گۆڕانی واتا، بە پلەی مێژوویی، دەباتەوە سەر ئەم خاڵانە:

١. دەركەوتنی پێویستی سەردەمی تازە.
٢. پێشكەوتنی كۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری.
٣. هەست و نەستی سۆز و دەروون.
٤. جەواشەبوونی زمانەوانیانە.
٥. گواستنەوەی واتا بە (خواستن).
٦. تازە كردنەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

خاڵی یەکەم گشتیە و لە هەموو خاڵەکانی تردا ئەو پێویستیە هەیە. ئەگەر ئێمە بواری (واتاگۆڕین) بکەین بە بواری (واتادانەوە)، دەتوانین یەك هۆ دیاری بکەین، وەك: (پێشکەوتنی شارستانیانەی مرۆڤایەتی). پێشکەوتنی شارستانی هەموو جۆرەکانی پێشکەوتن دەگرێتەوە، وەك (کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، تەکنەلۆژی، ژیاری، کەلتووری، هونەری، ...). لەلایەکی ترەوە، کاتێك کە پێشکەوتنی شارستانی زۆری هێنا ناچار دەبین کە پەنا ببەین بۆ تازەکردنەوە، بۆ لادان لە واتای بنجی. سەبارەت بە پێشکەوتن، نموونەی کاری (سووتان) وەردەگرین، وەك لە سەر ئەم نەخشەیە (بە پێی تێپەڕینی کات) واتای داوەتەوە:

سووتان: (پووش + ئاگر، دار + ئاگر، خەلووز + ئاگر، نەوت + ئاگر، چرا + ئاگر، گلۆپ + کارەبا).

لە ئەو نموونانەدا، دیارە کە پێشکەوتنی تەکنەلۆژیای ئاگر وای کردوە کە هەنگاو بە هەنگاو لە گەڵ مێژوودا کاری (سووتان) خۆی بلوێنێت لە ڕووی واتاوە، تا ڕادەیەك کە لە سەرەتای سەدەی رابردوودا ئەم کارە گەیشتوە بە بواری زانستی کارەبا، چونکە لە واتاکەی دواییدا بە هیچ جۆرێك، نە ئۆکسجین پێویستە و نە سووتەمەنی هەیە و نە سووتوو و نە بەرماوە هەیە. بە ئەم چەشنە کاری (سووتان) بوە بە گلێنەیەك بۆ واتادانەوە، بەڵام بە وزەی پێشکەوتنی شارستانی لە ژیاری کوردەواریدا. بەرانبەر بە ئەم بۆچوونە، ئەگەر کارەبا نە دۆزرایەتەوە ئێستا (ڕستەی گلۆپەکە دەسووتێت) پێویست نەدەبوو، کەچی لە گەڵ تێ پەڕینی ڕۆژگاردا ژیانی کوردەواری پێش دەکەوێت و ئەو گلێنەیەیش بە هیچ جۆرێك لە تیشکدانەوە ناوەستێت و ئەلبوومەکەی فراوانتر و ڕەنگینتر دەبێت، لە ڕووی واتاسازییەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**٩/١: گەشەكردنی زمان:**

زمانەوانی فەرەنسی (دی مارتنێت) دەڵێت: هەموو زمانێك لە گەڵ پەیدابوونیدا هۆكاری گۆڕان هەڵ دەگرێت، چونكە هەر هەموویان ئەو تەلیسمەیان تێدا هەیە كە ئاسان ببنەوە و ئەركێكی زۆر نەخەنە سەر ئەو كەسانەی كە قسەیان پێ دەكەن و بەكاریان دەهێنن. سەبارەت بە ئەم گوتەیە، مامۆستای خوالێخۆشبوو (محەمەد مەعرووف فەتاح) دەڵێت: زمان و گۆڕان شان بە شانی یەكتری دەڕۆن و تەنها كاتێك زمان لە گۆڕان دەكەوێت، كە بەرەو لە ناو چوون بڕوات. لە ئەم ڕووەوە، ئێمەیش دەڵێین:

**یەكەم**: هەموو كەسێك لەناخیدا بزافی واتاگۆڕی هەیە، هەموومان دەمانەوێت بتوانین ئەوەی پێی مەستین بە (وشە) دەری ببڕین، بەڵام وەك ژمارەی وشەی زمان دیاریكراوە و سنووردارە، ناچارین زۆر بكەین لە وشە بۆ داهێنانی واتایەكی تر. بۆ نموونە، گۆران دەڵێت:

هەر چەند دەكەم، ئەو خەیاڵەی پێی مەستم
بۆم ناخرێتە نێو چوارچێوەی هەڵبەستم
لێكدانەوەی دەروون، قسەی زمانم
بۆچی وەها دوورن لە یەك؟ نازانم

واتە، هەموو مرۆڤێك پێویستە بەوەی كە سامانی ئاخاوتنەكەی بگەیەنێت بە هەموو ڕووبەری واتا. هەر لە بەر ئەوەی كە ژمارەی وشەكان دیاری كراوە، مرۆڤ پەنا دەبات بۆ (واتادانەوە). بۆ پاساودانی ئەم بۆچوونە، لە نێو هەر نووسینێكی كاریگەردا، دەیان بەكارهێنانی نوێی وشە هەیە كە بۆ یەكەم جار بەكار هێنراون. كەوابوو، هەموو بیرگوشێكی بلیمەت و جەربەزە داهێنەرێكی واتاسازە، كاتێك كە بە حەزەوە دەدوێت، یان كاتێك كە بە حەزەوە دەنووسێت.



منتدى إقرأ الثقافي

**دووەم:** بەپێی خاڵی یەكەم، ژمارەی وشەی هەر زمانێك دیاریكراوە، بەڵام ئەگەر هەر وشەیەك یەك واتای ببەخشیبا، ئەوا ئەو زمانە دەبوو بە زمانێكی مەكینەیی، نەك زمانی مرۆیی، چونكە زمانی ئاوا ئەم سیمایانەی دەبێت:

**(١)**: كێشەی (وەرگێران) لە ئارادا نە دەما، چونكە هەر كۆمپیوتەرێك دەی توانی جێی مرۆڤ بگرێتەوە، چی لە نووسین و چی لە خوێندنەوە و چی لە ئاخاوتندا.

**(٢)**: وەك زانراوە ژمارەی واتای ڕستە لە دەبڕیندا بێ كۆتاییە، كەواتە دەبوو ژمارەی وشەی زمانەكەیش بێ كۆتایی بێت، ئەوەیش نابێت.

**(٣)**: زمانی ئاوا لە فەرهەنگێك دەچێت كە كۆمپیوتەرێك، بە ڕیزكردنی پیتەكان، وشەكانی دانابێت، بەڵام ژمارەیەكی كەم لە ئەو ڕوخسارانە واتا دەبەخشن.

لە ئاستی ئەم بۆچوونانەدا، دەتوانین بڵێین: چی گوترا لە ئەو گوتەیەی زانای بەرزی زمانەوانی (جۆمسكی) دەرناچێت كە گوتوویەتی (زمان ژمارەیەكی دیاریكراوە لە وشە و ڕێسا بۆ دەربڕینی ژمارەیەكی دیاری نەكراو لە ڕستە). سەبارەت بە (زمانی نموونەیی)، واتاساز (لاینز)، ئەو زمانە بە نموونەیی دادەنێت كە هەر ڕوخسارێك یەك واتا ببەخشێت. پاشان دەڵێت: باری نموونەیی ئاوها لە هیچ زمانێكی سروشتیدا سەر ناگرێت، چونكە زمان پڕە لە دیاردەی هاوبێژی (Synonymy) و هاوڕوخساریی (Homonymy). ئەو زمانەی (لاینز) جودای دەكاتەوە لە سروشتی، دەشێت زمانێكی دەستكرد بێت، وەك لە پێشتردا باسمان كرد. لەلایەكی ترەوە، (پالمەر) داكۆشان دەكات لە پەیوەندی نێوان ڕێزمان و واتاسازی و بەرانبەر بە بۆچوونەكەی (چۆمسكی) دەوەستێت، كە ئەو دوو بابەتە دوو لایەنی سەربەخۆن لە یەكتری. بێگومان، ئەو جۆرە ڕێزمانە (ڕوخساری)یە دوورە لە كیشوەری ئاڵۆزی (واتاسازی)، چونكە واتای هەر ڕستەیەك مەگەر هەر مرۆڤ خۆی لێكی بداتەوە. هۆی ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو راستیەی كە لە زماندا فرەواتایی و واتادانەوە هەیە. ئەم بابەتەیش لە گەڵ بیر و بۆچوونی (پالمەر) و (لاینز)دا دەگونجێت، بەڵام لە بیروبۆچوونی (چۆمسكی)دا ناخونچێت، یان ناگونجێت، چونكە كێشانی هێڵی سوور لە نێوان ڕێزمان و واتاسازیدا كردەوەیەكی زۆر زۆر گرانە و زۆر



منتدى إقرأ الثقافي

دژواره و ڕەنگـە مـەودای ئـەم بۆچـوونە لـە مـەودای بیرگوشـینی ئێمـە تێپـەڕ بکـات. لـە بەشەکانی تری ئەم کتێبەدا، هەندێك لە ئەو پردانە دەخەینە روو کە لـە نێـوان هـەر دوو بزافی (**ڕێزمان**) و (**واتاسازی**)دا هەن و چالاکی دەنوێنن، وەك:

(١): لە هەندێك کاردا واتای (بەرکاری ڕێزمانی) دەتوێتـەوە لـە داهێنـانی واتایـەکی تـازەدا، وەك: (**بەرگـەگرتن، هەناسـەدان**، درز بـردن، ...). بـە ئاشـکرا دیـارە کـە وشـەکانی بـەرایی بریتین لە (بەرکار) بە (ڕێزمان)، بەلأم لە هەمان کاتدا بریتین لە (مـۆرفیمی واتـاگۆڕ) بـۆ بزافی (واتاسـازی)، چـونکە واتـای (بـەرکار) هـەرس دەبێـت لـە قـەوارەی ڕێزمـانی کارێکی تردا.

(٢): لـە رسـتەیەکی رابـردوودا وەك: (گلۆپەکـە سـووتا) واتـای (پەککـەوتنی گلۆپەکـە) دەچەسـپێت، کەچـی لـە رسـتەیەکی رابـردووی بەردەوامـدا، وەك: (گلۆپەکـە دە سـووتا) واتایەکی پێچەوانە دەچەسپێت. کەواتـە، پێشـکاری ڕێزمـانی (دە)، یـان دەمکـاتی رسـتەکە بوە بە (واتاگۆڕ) لە واتادانەوەی کاری (سووتان)دا.

(٣): ستایل و نەخشەی بڕین لە واتای بەرکاردا، وەك (جل) لە (جـل بـڕین)دا، کـار دەکاتـە سەر واتای کاری (بڕین)، وەك دەگوترێت (ئەم کراسە بڕینەکەی جوانە).

(٤): لە کاری (نان خواردن)دا، واتای بـەرکاری ڕێزمـانی (نـان) فـراوان بومتـەوە بـۆ هـەموو جۆرەکانی خوادەمەنی، کەچی ئەم واتا تازەیەی بەرکاری (نان) هەرس بوە لـە واتـای کـاری (نان خواردن)دا. ئەگەرنا، واتای کاری (خـواردن) بنجیـە و نـەگۆڕاوە، چـونکە روودانـەکەی ڤیدیۆییە.

سەبارەت بە بۆچوونی ئێمـە، بـە راسـتی بۆچـوونەکەی چۆمسـکی، سـەبارەت بـە کێشانی هێڵی سوور لە نێوان (ڕێزمان) و (واتاسازی)دا، راست و دروستە، ئەگـەر مەبەسـتی هەر (واتای بنجی) بێت و بەس، بەلأم لە واتای (نابنجی)دا بۆچوونەکەی (پاڵمەر و لاینـز) راست و دروستە، چونکە کێشانی هێڵی سوور لە نێوان (ڕێزمان) و (واتاسازی)دا لە ئەستەم دەچێت، لە بەر ئەوەی هەرەوەزی نێوان (ڕەنجی بـیری مرۆیـی) و (بڕشـتی ڕێزمـان) واتـای سەربار و نابنجی بەرهەمهێناوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**١٠/١: سەرچاوە ڕەسەنەكانى واتا:**

دكتـۆر ابـراهيم مختـار عمـر دوو سەرچـاوەى ديـاريكردوە بـۆ نۆژەنكردنــەوە (innovation) و بۆ پەيداكردن ( Creativity)، وەك:

**يەكەم:** كەسانى بەهرەدار نووسەران و بوێژان.

**دووەم:** كۆڕ و دەزگا زانستييەكان.

سەبارەت بە خاڵى يەكەم، بۆ ئێمەى كورد، چەند سەرچاوەيەكى ڕەسەن هەيە بۆ دۆزينەوە واتاى نوێ، وەك:

- پەندى پێشينان و قسەى نەستەقى كوردەوارى
- بەيت و بالۆرەى كۆن
- بەرهەمى نووسەرەكانى پێشوو
- سامانى زارەكى و فۆلكلۆرى
- گۆرانى و لاوك و حەيران و هۆرە

بۆ نموونە، وشەى (تـەبايى) لـە هەڵبەسـتێكى (حـاجى قـادرى كـۆيى)دا هـاتوە كـە ئەمڕۆ زۆر باوە. يان وشەى هەودا (تاڵى دەزوو/ ئاوريشم) لە هەڵبەسـتى (نـاڵى)دا هـاتوە و لە گۆرانى فۆلكلۆريـدا مـاوە، وەك دەڵێن: (زوڵفـى هـەودا هەودايـە)، واتـاى ئـەم وشـەيە تـا ئێستا لە گۆرانيدا دەگوترێتەوە، هەر چەندە واتاكەى سست بوە لە بيردا. هـەروەها، ئەگـەر بڕوانين لە بەشى (لە ناوچوونى واتا)، دەبينين كە پەنـدى (مـاڵى خـۆ نـەخۆر بـۆ چـەكمە بۆر) چەند سەرنجێكى تێدا هەيە، كە بۆ ڕۆژگارى ئەمڕۆ پێويستن.

سەبارەت بە خاڵى دووەم، لـە پـاش بـەيانى يـانزدەى ئـازارى (١٩٧٠)، بەرنامـەى خوێنـدنى كـوردى (١٢ سـاڵ خوێنـدن بـە كـوردى) و كـۆڕى زانيـارى كـورد هـەزاران وشـەى تازەيـان بەخشيوە بە زمانەكە. ئەمانە هەمووى ڕاستن، بەڵام خاڵێكى سێيەم هەيە ئەويش بريتيـە لـە (شـۆڕش و ڕاپـەڕين)، كـە زمـان يـەكجار پـەرەى پـێ دەسـتێنێت. وەك نموونەيـەكى



منتدى إقرأ الثقافي

کاریگەر، ڕاپەڕینەکەی ساڵی (١٩٩١) چەند واتایەکی تری خستە بەر بەرەو لە زمانەکەدا: وەك:

تـەبایی، هێـزا، هاوکـار، بـزاڤ، بـژێو، بورسـە، تۆزوبـا، بـە ڕاشـکاوی، هـەرێم، ئاودیوکردن، لەمەڕ، وێڕا، کۆڕەو، باجگە، ئەلتەرنەتیف، بەرە، تـیرۆر، پەرلـەمان، سۆشیال، دیموکرات، گەمارۆ یـان ئابلۆقـەی ئـابووری، بـرا کـوژی، خۆکوژی، بەنـدە، دەزگـا، پرۆسـە، کۆمیتە، شەڕی کەنداو، سەروەری، فیفتی فیفتی، فراکسیۆن، ڕژێـم، شـڕەخۆر، شـەڕانگێری، کیمیاباران، پاسۆك، پارێزگاران، پێ زانـین، بۆچـوون، سانسۆر، ئەگەرەکان، هیۆرکردنـەوە، سیاسـەتمەدار، پەرلـەمانتار، ئۆپۆزسـیۆن، بـازاڕی دزان، مـەرز، عەسـکەرتاری، ریفرانـدۆم، لیسـت، فاکتـەر، پێشڤەچـوون، بـزاڤ، هـاوردە، هاوردەکـار، ئـاوارە، زێرڤـانی، بـەرخودان، ماندوونەناس، رووماڵ، ... .

لە پاش ڕاپەڕین، زمانی دام ودەزگاکانی هەرێم سەرتاپا کران بە کوردی. هـەر لـە بەر ئەوە، بـە هـەزاران وشـەی نـوێ و واتـای نـوێ بـەکار دەهێـنن، بـەپێی پێویسـتی ژیـانی ڕۆژانە. ئەم دیاردەیە، زۆرتر پەرەی سەند کاتێك کـە گشـت فـەرمانگاکانی هـەرێم کەوتنـە پێشبڕکێ و لە مـەراتۆنێکی گشتی و پـیرۆزدا، زاراوە وتێکسـتە فەرمیـەکان وەرگێـڕدران بـۆ کـوردی و ئـەرکێکی گـەورەی نەتەوایـەتی لـە ماوەیـەکی زۆر کورتـدا جـێ بـە جـێ کـرا. ئەوەیش لە یاد نەکەین کە بە سەدان و بە هەزاران لـە فەرمانبـەرە دڵسۆزە کوردیزانـەکان خۆویستانە و ڕاستەوخۆ لە ئەم هەڵمەتەدا بەشدار بوون.



منتدى إقرأ الثقافي

**١١/١: جۆرەکانی واتای کار:**

ئەگەر بڕوانین لە کاری زمانەکە دەبینین کە چەند جۆرێك لە واتا هەن، وەك:

**یەکەم: واتای بنجی:**

بریتیە لە یەکەم واتای ڕوخساری دەرکەوتووی کارەکە. ئەم واتایە پەتیە، بێ تۆێکڵە بێ پێچ وپەنایە و ڕوونە، وەك:

**بڕین**: بڕینی تشتێك (بەرکار) بە ئامێرێکی بڕ و بە کارهێنانی وزەی (بکەر) لە ڕووداوەکەدا.

**گرتن**: گرتنی شتێك (بەرکار) بە دەست و بە کارهێنانی وزەی ماسولکەکانی (بکەر).

**سووتان**: سووتانی سووتەمەنی (دار و پووش) بە ئاگر لە گەڵ پێویستیدا بۆ ئۆکسجین.

ئەم واتایە کۆنترین واتای ڕوخساری وشەکەیە و بە گشتی لە گۆکردنی وشەکەدا دەهێتە کلاورۆژنەی بیرەوە. هەروەها، ئەم واتایە لە لای (نیدا) ناسراوە بە (ئەو واتایەی کە دەگاتەوە بە وشەی فەرهەنگی کاتێك کە ناو دەبرێت). لە لایەکی ترەوە، ئەم جۆرە واتایە دەبن بە (گلێنە)ی ژمارە (سفر) بۆ واتادانەوە و بۆ جۆرەکانی تری واتا.

**دوەم: واتای سەربار:**

ئەم جۆرە واتایانە جودا بوونەتەوە لە واتای بنجی، چونکە لە کاتی پێویستدا لە دایك دەبن و لەکاتێکی تردا ئاوا دەبن. لە بەر ئەوە (نەگۆڕ) نین. سەبارەت بە پەیدابوون، واتای سەربار کاتێك پەیدا دەبێت کە واتای بنجی (سیما)یەك لە سیما تایبەتیەکانی فڕێ بدات، وەك: کاری (سووتان):

(١): بکەرێکی سست، کە بەرجەستە و بسووت بێت

(٢): خەرجکردنی ئۆکسجین

(٣): بەخشینی وزەی ڕووناکی

(٤): بەخشینی وزەی گەرمی



منتدى إقرأ الثقافي

(٥): هەبوونى دووكەڵ و سووتووى پاشەڕۆك

(٦): دۆخى (بكەر) دەبێت بە تشتێكى بێكەڵك.

لە هەر واتايەكى كارى (سووتان)دا، ئەگەر يەكێك لە ئەو سيمايانە گۆڕدرا، يان نەما، يا جێلەق بوو، ئەوا واتاى (سووتان)يش دەگۆڕێت لە واتاى بنجيەوە بۆ واتايەكى لاوەكى. يان، ئەگەر هەر خاڵى (٦) خرايە ژێر زوومى واتايى و خاڵ كانى تر كەنسلكران، ئەوا واتاكە دەبێت بە واتايەكى خوازراو، وەك (ئەم چەكەپارەيە سووتاوە. ئەم دەرمانە سووتاوە، سەلاوەكەم سووتا، ...).

**١٢/١: فراوانبوونەوەى واتا:**

فراوانبوونەوەى واتا بريتيە لە واتادانەوەى وشەكان، بە ئەوەى كە وشەيەك لە واتاى پەتى خۆى بترازێت و واتايەكى تر بداتەوە بۆ پێويستى سەروەختەكەى. سەبارەت بە كار لە زمانى كورديدا، ئەم دياردەيە زۆر بەبرشت و بەرفراوانە و زۆربەى كارەكان بريتين لە گلێنەى واتادانەوە. لە چەند جێيەك لە ئەم نووسينەدا، نموونەى كارى (سووتان) و بلاوبوونەوەى واتاكەى دەرخراوە. كارى (سووتان) لە سووتانى پووشەوە و گەيشتوە بە سووتانى هيتەر بە كارەبا. هەروەها كارى (بڕين)، يان (گرتن)، يان (كەوتن) يان ڕوخسارە داڕێژارەكانيان بريتين لە چەندين نموونەى زيندوو لە فراوانبوونەوەى واتا. لە نموونەيەكى تردا كارى (كولان) واتاكەى خوازراوە بۆ ڕووداوى (تووڕەبوون)، وەك: (ئەوە ئازاد بۆچى وا دەكولێت)، واتە، (ئازاد بۆچى وا تۆڕەيە). نموونەيەكى تر لە ئەم بوارەدا، بريتيە لە كارى (لەرزين)، كە لە سەرەتاى سەدەى بيستەمەوە فراوان كراوەتەوە بۆ لەرزينى مەكينە. پاشان، ئەگەر هەر لە دەوروبەرى ئۆتۆمبيل و مەكينەدا بگەڕێين، دەتوانين دەيان كارى تر دەستنيشان بكەين كە بۆ پێويستى زمانەكە واتاكەيان گۆڕاوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**١٣/١: تەسکبوونەوەی واتایی:**

زاراوەی (تەسك بوونەوەی واتا ـ Norrowing) بە کارهێنراوە بۆ ئەو وشانەی کە واتاکەیان تەسك دەبێتەوە و تایبەتمەندیەکی واتایی پەیدا دەکات، وەك (دکتۆر ابراهیم أنیس) دیاریکردوە. لە لایەکی ترەوە، (دکتۆر احمد مختار عمر) چەند نموونەیەکی دیاریکردوە لە زمانی ئینگلیزی و عەرەبیدا. لە زمانی کوردیدا، نموونە زۆرن لە کاردا و لە ئێرەدا دوو نموونەی ڕوون و دیار دەخەینە پێش چاو، وەك:

**یەکەم:** کاری (خواردنەوە)، وەك:

ئایا دەزانیت ئازاد (-) دەخواتەوە؟

دووەم: کاری خواردن

ئایا دەزانێت ئازاد (-) دەخوات؟

لە ئەم دوو ڕستەیەدا کە تێبەرن، ئەگەر بەرکارەکە ناونەبرا، وەك (ئاو خواردنەوە) و (بەرتیل خواردن)، ئەوا واتاکەیان تەسك دەبێتەوە بۆ (خواردنەوەی تشتی سەرخۆشکەر) و بۆ (بەرتیل وەرگرتن). ئەم دوو واتا تەسکە زۆر زەق و ئاشکران، بۆ نموونە ئەگەر گوترا: (ئازاد چوو بۆ خواردنەوە)، ئەوا کەس خەیاڵی بۆ ئەوە ناچێت کە ئازاد چووبێت بۆ (ئاو خواردنەوە). لەلایەکی ترەوە، ئەم دیاردەیە دەچەسپێت بە سەر (واتای شێوازگر)دا کە تایبەتمەندی دەگرێتە خۆی. بۆ نموونە کاری (بڕین) لە (جل بڕین، پرچ بڕین، خشت بڕین)دا تەسك دەبێتەوە، چونکە (جلبڕ و پرچبڕ، یان خشتبڕ) ئەو کەسانەن کە پسپۆڕن لە ئەو جۆرە بڕینەدا، نەك بڕینی پەتی: وەك لە ئەم ڕستانەدا دیارە، وەك:(ئەم کراسە جوان بڕاوە)، (بڕینی قژی شیلان زۆر جوانە، یان (ئازاد دووسەد خشتی بڕی). کەواتە، پرۆسەی (بڕین) لەسەر ئەندازە و پێوانەیە، بە پێی شارەزایی و دەستی وەستای کارامە لە پیشەکەدا. بۆ نموونە، ئەگەر واتای تەسکی شێوازگری پشتگوێ خرا، دەتوانین بڵێین (ئەو کراسە جوان دادڕاوە، یان هەڵقاچینی قژی شیلان زۆر جوانە، یان ئازاد دووسەد خشتی شەق و پەقکردوە).



منتدى إقرأ الثقافي

**١٤/١: سووکایەتی واتایی:**

**مامۆستا محمد معروف فەتاح، لە کتێبی زمانەوانیدا، بە (نزم بوونەوەی واتا) ناوی ئەم بابەتەی بردوە. لە هەمان کاتدا نزم بوونەوەی واتای وشەی (بۆر)ی کردوە بە نموونە، کە لە وشەی (بۆرە پیاو)دا دەرکەوتوە. سەبارەت بە کار، نموونە زۆرن وەك لە بەشی (تەسك بوونەوەی واتا)دا باسکران. چەند نموونەیەکی تر لە کاری زمانەکە کەوتوونەتە بەر سووکایەتی واتایی، بەڵام بە پلەیەکی کەمتر وەك (هەڵ گرتن، خواردن،...). ئەم کارانە، هەرچەندە خاوەنی ڕیزێك واتابن، بەڵام واتای سووکایەتی خەریکە گرەو بباتەوە (ئەگەر بە ڕووتی گۆ کران)، وەك: (هەلگرتن: ڕەدووخستن)، یان، (خواردن: بەرتیل خواردن).**

**١٥/١: گواستنەوەی واتا:**

**دیاردەی (گواستنەوەی واتا) بریتیە خواستنی واتای کارێك بۆ واتایەکی تر بە یەکسانی، واتە بەبێ تەسك بوونەوە یان فراوان بوونەوەی واتایی. بۆ نموونە، کاری (کووژاندنەوە) وەك (کووژاندنەوەی ئاگر)، گوێزراوەتەوە بۆ (کوژاندنەوەی ڕادیۆ و تەلەفزیۆن)، وەك: (کووژاندنەوەی ئاگر، کووژاندنەوەی چرا، کووژاندنەوەی گلوپ، کووژاندنەوەی ڕادیۆ، کووژاندنەوەی تەلەفزیۆن، کووژاندنەوەی ڤیدیۆ، کووژاندنەوەی کۆمپیووتەر، کووژاندنەوەی مۆبایل، ...). لە نێرەدا با بزانین، ئەم گواستنەوەیە چۆن پەیدا بوە؟**

**یەکەم**: **کووژاندنەوەی ئاگر واتایەکی ڕاستەوخۆیە.**

**دووەم**: **کووژاندنەوەی چرا، بریتیە لە کووژاندنەوەی (ئاگر)ی (پلیتە)ی (چرا)، بە بازدان بەسەر (ئاگری پلیتە)دا.**

**سێیەم**: **لە گلۆپدا، ڕووناکی وەك ڕووناکی ئاگر هەیە، هەر لەبەر ئەوە دەبا بگوترابا (کوژاندنەوە)ی (ئاگر)ی (پلیتە)ی (گلۆپ). ئەم واتایە، لە سەر ئەندازەی واتای دووەم بوە بە (کووژاندنەوەی گلۆپ). لە ئەم واتایەدا، وشەی (ئاگر) یەکسانە بە (کارەبا). واتە کوژاندنەوەی سویچی (کارەبای گلۆپ).**



منتدى إقرأ الثقافي

**چوارەم**: لەخاڵی پێشتردا دیاردەیەك دەرکەوت. وەك (کوژاندنەوەی ئاگری چرا یەکسانە بە کوژاندنەوەی کارەبای گلۆپ). لە ئەم واتایەدا، (کوژاندنەوەی گلۆپ یەکسانە بە بڕینی کارەبای گڵۆپ) و ئەم کردەومیەیش یەکسانە بە بڕینی کارەبای هەر ئامێرێك هەر چەندە ئەو ئامێرە سەرچاوەی ڕووناکی نەبێت وەك گڵۆپ. هەر لەبەر ئەوە، ئەو واتایە گوێزراوەتە بۆ (بڕینی کارەبا) لە ئەو دەزگایانەی کە بە کارەبا ئیش دەکەن. لە ئەم ڕوانگەیەوە ئەگەر بیر بگوشین. دەتوانین بڵێین: ئەگەر (گلۆپ) ڕووناکی بەخش نەبا لە جێی (چرا)، ئەوا واتادانەوەی (کووژاندنەوە) نەدەگەیشت بە گلۆپ و پاشان نەدەگوێزرایەوە بۆ ئامێر کارەباییەکان. لە پاشتریش، ئەو واتادانەوەیش دروست نەدەبوو وەك (کووژاندنەوەی گرام، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ڤیدیۆ، مۆبایل...). ئەوەی شایانی باسە، بە پردێکی تردا، کاری (کووژاندنەوە) گوێزراوەتەوە بۆ (ئامێرە میکانیکیەکان: مەکینەمەنی). هەر لە سەرەتایشەوە ئەم واتایە گوێزراوەتەوە بە پردێکی تردا، بۆ (سڕینەوە)ی شتی نووسراو، یان نیگار کێشراو.

**١٦/١: لەناوچوونی واتا:**

زانای بەناوبانگ (تۆڵمان) گوتوویەتی: بەشێکی گەورە لە (سامانی ئاخاوتن) دەکەوێتە بەرلە ناو چوون (پووچانەوە). بۆ ئەو مەبەستە، چەندین نموونەی دەرخستوە کە نەماون. لە ناو زمانی کوردیشدا، ئەم دیاردەیە هەیە و باشترین ڕێگا بۆ دۆزینەوەی ئەو وشە لە ناوچوانە بریتیە لە قسەی ئەستەق و پەندی پێشینان و لە بەرهەمی وێژەیی بوێژە دێرینەکان. یان بەیت و لاوك و حەیران. ئێمە دەڵێین: پەندی پێشینان باشترین ڕێگایە، چونکە هەر پەندێکی کاریگەر، هەرچەندە یەکجار زۆر کۆن بێت، ڕوخساری دەپارێزرێت و بە هەمان ڕێتم و ئاوازەوە، یان بە هەمان کێش و سەرواوە، یان بە هەمان تان و پۆی ڕێزمانیەوە، نەوە بە نەوە بە سنگ هەڵی دەگرن و بۆ یەکتری دەی لێنەوە. بۆ نموونە پەندی: (ڕەگ بەرەکێشە و گلێخە و بە بنەتۆو) چوار وشە هەڵ دەگرێت، وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

یەكەم: وشەی (ڕەگ)، وەك: ڕەگی دار و درەخت (واتای بنجی)، ڕەگی ددان، سەگی دوو ڕەگ، یان بە هێستر دەگوترێت (دوو ڕەگ)، چونكی باوكی گوێدرێژە و دایكی ماینە، یان بە كەسانی چەپەڵ و شەڕەنگێز دەگوترێت (ڕەگەكەی پیسە).

لە ئێرەدا، دەردەكەوێت كە وشەی (ڕەگ) یەكسانە بە وشەی (رەگەز) لە زانستی (بۆماوەزانی)دا.

**دووەم:** وشەی (ڕەگێشە): ئەم وشەیە پێكهاتوە لە (ڕەگ) و پارچۆلكەی (ێشە). ئەم زاراوەیە بەرانبەر بە وشەی (الوراثة) دەوەستێت، ئەو وشەیەی كە لە زمانەكەدا لە ناوچوە، بەلاَم كاتێك كە (علم الوراثة) پەیدابوو، ناچار بووین پەنا ببەین بۆ داتاشینی وشەی كاڵ و كرچ، وەك (بۆماوەزانی، یان بۆماوەیی).

**سێیەم:** وشەی (گلێخە)، بریتیە لە گیایەك كە ناوەكەی لەناوچوە و بەلاَم بە ناوی (گێلاخ) و (گێلاخە) ماوە.

**چوارەم:** وشەی (بنەتۆو): ئەم وشەیە دوو واتای هەبوە:

(١): بنەتۆوی دانەوێڵە بریتیە لە ئەو بڕەی كە تۆو دەكرێت، وەك دەگوترێت گەنمەكە دە تەن دەرچوو بەلاَم (بنەتۆو)ەكەی یەك تەن بوو.

(٢): بریتیە لە تۆوی پیاز یان (فیسقە پیاز)، كە هەندێك سەوزە و گوڵ و گیا بە شەتل سەوز نابن، دەشێت تۆوی بنەكییان هەبێت. لە جیاتی ئەم وشەیە، ڕەنگە وشەی (سەلك) یان (فیسقە) یان (پیازیلكە) بەكار هاتبێت.

سەبارەت بە واتای ئەم پەندە، دەتوانین ئەم شرۆڤەیە بخەینە روو: لە مرۆڤدا، گوڵی هەر كردەوەیەكی باش (ئەگەر هەبێت) بە ڕەگێشە (وراثة) دەگوێزرێتەوە و لە پێشینانەوە بۆ بەرەبابی پاشینان. بەلاَم گواستنەوەی گوڵی گلێخە زۆر ئاسانە، چونكە ئەگەر گوێزرایەوە، بنەتۆوەكەی (یان پیازیلكەكەی) لە گەڵدا دەگوێزرێنەوە و لە جێیە تریش سەوز دەبێت. واتە، رەگی كردەوەی باش، وەك ئەوە وایە كە لە (جین)دا بێت و بە (ڕەگێشە) بگوێزرێتەوە. بەلاَم گواستنەوەی (گلێخە) زۆر ئاسانە، ئەگەر بنەتۆوەكەی لەگەڵ هەڵ بگریت. ئەم پەندە دەشێت پێش سەدان ساڵ گوترابێت، بەلاَم ئەم وشە



منتدى إقرأ الثقافي

جوانانەی هەڵ گرتوە. ئەوەی شایان باسە ، ئەم پەندە خۆیشی لە مردندایە، چونکە تەنها لە دەمی پیاوە زۆر زۆر پیرەکانەوە دەبیسترێت. بە ئەم پێیە، دەبێت پەندی پێشینانمان چەندین وشەی دەگمەن هەڵ بگرێت، وەك: (چەرخ)ی لە (چەمەر) چوە، واتە (هیچی بە سەر هیچەوە نەماوە). یان: (شیر دا بۆ داپیر دا)، واتە (ئەگەر مانگا پیرەکە شیری هەبێت و ئەگەر ئەو شیرەیش فریای نەنکە پیرەیش بکەوێت، پێش مردنی). یان (جومعە ببارۆ، شەمە خۆش کەرۆ، شەمە ببارۆ، پێنج و شەش کەرۆ)، واتە (جومعە بباریت شەمە خۆش دەکات، شەمە بباریت پێنج و شەش دەکات).

### ١٧/١، بزاڤی واتادانەوە

لە زمانی دروستکراودا، هەر یەك (ڕوخسار) دەشێت یەك (واتا) ببەخشێت، بەڵام لە زمانی سروشتیدا، هەر ئەو تاکە ڕوخسارە چەند لاواتایەکی سەربار دەداتەوە، بەڵام برشتی واتادانەوە دەگۆڕێت لە نموونەیەکەوە بۆ یەکێکی تر. بۆ نموونە، کاری (گرتنەوە[٧]) زۆر بە برشتە، وەك:

(گرتنەوەی ئاو، گرتنەوەی جومگەی لەجێ چوو، گرتنەوەی قوڕ، گرتنەوەی باڵداری تەریو، گرتنەوە لە ڕاکردندا، گرتنەوە بە واتای باڵکێشان بە بە سەر رووبەرێکدا، گرتنەوەی قاوە گرتنەوە، ...).

سەبارەت بە فرەواتایی (Polysemy)، پالمر دەڵێت (سەربار بە ئەوەی وشەی جیاواز واتای جیاوازی هەیە، بەڵام هەر وشەیەك خۆ بە خۆی کۆمەڵێك واتای جیاوازی هەیە). برگەی یەکەمی ئەم دەربڕینە ئاساییە، بەڵام برگەی دوەم ئەوە دەگەیەنێت کە برشتی واتادانەوە هەیە لە وشەی زماندا. واتە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە هەر وشەیەك لە پەیدابوونیەوە چەند واتایەکی لە گەڵدا بێت، بەڵام ئەوە دەگەیەنێت کە هەر وشەیەك واتایەکی پەتی هەیە، بەڵام مرۆڤ خۆی داهێنەرە و برشتەکەی خۆی بەکار دەهێنێت بۆ

---

[٧] بۆ زانین، لە ئەم کتێبەدا، بەشی (هەشتەم) تەرخانکراوە بۆ واتادانەوەی کاری (گرتنەوە).



منتدى إقرأ الثقافي

پێویستی دەربڕین و بەخشینی واتای نوێ بە وشەكە. ئێمەیش دەڵێین: هەر وشەیەك بۆ یەك واتا پەیدا بوە، كە واتای پەتی و بنجیە، بەڵام واتاكانی تر بە تێپەڕبوونی ڕۆژگار پەیداكراون. ئەمە و سەبارەت بە ئەوەی كە باسكرا (لاینز) دەڵێت (باش نیە وا دابنێین كە هەر وشەیەك واتایەكی نەگۆڕی هەیە). واتە، هەر وشەیەك بزافی (واتادانەوە)ی هەیە. ئێستایش وەك كورتەیەك بۆ ئەوەی دەربارەی بڕشتی واتادانەوە باسكرا، دەتوانین بڵێین: هەر وشەیەك لە زماندا بۆ یەك واتا پەیدا بوە و ئەو واتایەیش بریتیە لە واتای پەتی و بنجی، كە كۆنترین واتای ئەو وشەیەیە. لە گەڵ پەیدا بووندا، ئەو وشەیە بزافی واتادانەوەی تێدا هەیە، بەڵام بە بیرگوشینی مرۆڤ و بە بە سەرچوونی ڕۆژگار، واتا سەربارەكان دەردەكەون. ئێمەی مرۆڤ بڕشتی داهێنانی واتای نوێ لە بیرماندا هەیە، بەڵام مەرجیش نیە هەر داهێنانێك ببێت بە (جێگیر). واتە، هەر تەنها ئەو واتایانە دەچنە نێو ئەلبوومی زمانەكە، كە پێویست بن و شایستەی ئەو بەكار هێنانە بن كە لە پێناویدا داهێنراون. كەواتە، وەك زانراوە، زمان دیاردەیەكە هەردەم لە بزافی پەرەسەندندایە.

**١٨/١: كاری بڕگەیی:**

سەبارەت بە كاری بڕگەیی (Phrasal Verbs) كتێبەكەی (كمال الخلايلى) بریتیە سەرچاوەیەكی باش بۆ زمانی ئینگلیزی. كاری بڕگەیی لە زمانەوانی كوردیدا بە (كاری دارێژراو) ناسراوە و چەند كۆمەڵەیەك لە پێشگری واتاگۆڕ هەیە بۆ ئەو كارانە وەك (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ) یان (سەر، بەر، دەر، وەر، لا)، یان لە جۆری تر. بە ڕاستی، كاری دارێژراو دووبەرێكی گەورە و فراوان لە ڕێزمان و لە واتاسازی دادەپۆشێت. لەلایەكی ترەوە، (پالمەر) دەڵێت: (ئەم كارانە، لە زمانی ئینگلیزیدا، واتاكەیان بە واتای پارچەكانەوە دەرناچێت و هەموو كارێكی دارێژراوی ئاوەها مەرج نیە واتا بەخش بێت). بۆ نموونە، لە زمانی كوردیدا (دەرفڕین، وەربردن) واتایان نیە، بەڵام (هەڵ فڕین، دەربردن) واتایان هەیە. ئەوەی (پالمەر) دەی ڵێت، سەبارەت بە زمانی ئنگلیزی، نەختێك جیاوازی هەیە لە گەڵ زمانی كوردیدا، چونكە كارە بڕگەییەكانی زمانی كوردی زۆربەیان دەبن بە گلێنەی



منتدى إقرأ الثقافي

واتادانەوە و دەبن بە سەرچاوەی بەبڕشت بۆ واتای خوازراو. پاشان لە زمانەکەی ئێمەدا، پاشگری (ەوە)[^٨] هەیە، کە ئەویش واتاگۆڕێکی زۆر بەهێزە و تا ئێستا ئێمە بە یەکەم واتاگۆڕی دادەنێین.

**١٩/١: واتای بڕگەیی و واتای پارچەیی:**

سەبارەت بە واتای ئیدیۆم، (پالمەر) نموونەی (to make a bed) لە زمانی ئینگلیزی دەهێنێتەوە، کە بە پارچە پارچەیی واتایەك دەبەخشێت لە چەشنی (سیسەم دروست کردن) و بە گشتی واتای ئیدیۆمی (ڕۆیشتن بۆ خەوتن) دەبەخشێت. لە زمانی کوردیدا دەگوترێت (با بی کەین بەشەو). لە پاشتردا، (پالمەر) دەڵێت: لە فلیمی گاڵتە و گەپدا کاتێك فەرمان دەدرێت بۆ (ڕۆیشتن بۆ خەوتن)، فەرماندراوەکە دەچێت کەرەستەی دارتاشی بۆ دروست کردنی سیسەم دەهێنێت. ئەدی ئێمە لەزمانی کوردیدا چی بڵێین، کە ئەم جۆرە ئیدیۆمە ڕووبەری زمانەکە دادەپۆشن و واتای پارچە پارچەییان بە هیچ جۆرێك چەسپ نیە لەگەڵ واتادانەوەی (یەك پارچەیی)دا، وەك: (گوێ گرتن، ناوك کەوتن. زمان گرتن. چاو شکاندن. ...). زۆر جار لە گاڵتە و گەپی کوردەواریدا، کاتێك دەگوترێت: (شیلان گوێ بگرە)، یەکسەر شیلان بە دەست گوێچکی خۆی دەگرێت، یان کونی گوێی خۆی دادەخات بە لەپ، تا دژواتاییەك پەیدا ببێت وەك (گوێ قەپات کردن) لە جیاتی (گوێ ڕایەڵ کردن). لە لایەکی ترەوە، کاتێك دەگوترێت: (ئازاد ناوکی کەوتوە)، پرسیار دەکرێت (لە کوێ کەوتوە؟). ئەم جۆرە کارانە سەرەڕای ئەوەی کە واتاکەیان بریتیە لەواتادانەوەی بڕگەیی، نەك پارچەیی، کەچی واتاکەیان دەتوانێت ببێت بە مەڵبەندێك بۆ واتادانەوە، وەك: (ناوك کەوتن): بە واتای (ترسانێك لە پڕ، زەندەق چوون، تۆقین). بە ڕاستی، ئەلبوومی ئیدیۆمی زمانەکەمان یەکجار فراوانە، هەر چەندە هێشتا دەستی توێژینەوەی ئەوتۆی پێ نەگەیشتوە.

[^٨]: بڕوانە بۆ کتێبی (ڕێزمانی پاشگری دووپاتی ەوە)/ هەولێر ٢٠٠١. ئەم کتێبە لە بەرگەوە بۆ بەرگ لە ئەو پاشگرە گرنگە دەکۆڵێتەوە. هەروەها، بڕوانە بۆ کەرتی سێیەم لە کتێبی (سێ مۆرکی ڕێزمانی کوردی/٢٠١٦).



منتدى إقرأ الثقافي

**٢٠/١: واتای بنجی و وتادانەوە:**

واتاسازی بـە ناوبـانگ (پاڵمـەر) پـەنا دەباتـە بـەر واتـای مەڵبەنـدی، یـان واتـای گلێنـەیی، بـۆ ئـەوەی نەخشـەڕێگایەك دابنێـت بـۆ پەیوەنـدی نێـوان واتاکـانی وشـەیەکی فرەواتا. ئەم ڕێگایە ڕەنگە برشتی هەبێت لە واتای کارەکانی زمانی کوردیـدا، چونکە هـەر کارێك واتایەکی بنجی و پتەوی هەیە، کە لە نێرەدا پێی دەگوترێت واتـای مەڵبەنـدی، یـان گلێنەیی. دەربـارەی ئـەم پۆلێنکردنـە، (پالمـەر) گومـانی هەیـە، چـونکە دەڵێت: پەیوەنـدی نێوان واتاکان کەم و زۆر جیاواز و هەڕەمەکیە. ئێمەش دەڵێین ئەم ڕێگایە زۆر کاریگەرە و دەتوانێت سەرەدەزووی گلۆڵە ئاڵۆسکاوەکان بدۆزێتەوە. هۆی ئەو ئاڵۆزیـەیش لـە ئەوەدایـە کە، ڕەنگە هەندێك پردی واتایی لە ناو چووبێت بـە هـەنگاوی ڕۆژگـار و پەیوەنـدی نێـوان دوورگە واتاییەکان بە ئاڵۆزی پسابێت.



منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی دووەم
# هوردبوونەوە لە كرۆكی واتـای بنجیدا

**١/٢: دەستپێك:**

بۆ ئەوەی واتای بنجی (واتای یەكەم) جودا بكەینـەوە لـە ئـەو واتایەنـەی كـە لـە سەری بنیاد دەنرێن، دەشێت لە یەكەم هەنگاودا لە پێكهاتە كرۆكیـەكانی ڕووداوی كـار تـێ بگەین، ئەوسا دەتوانین لە ئەو واتایانە تێ بگەین كە لە واتای بنجی لایان داوە. لە پێنـاوی گەیشتن بە ئەم مەبەستە، هەر جارەی كارێك وەردەگـرین و ئـەو ڕەگەزانـە دەخەینـە بـەر شیكار كە واتایان لـە سـەر دەگـەڕێت، یـان واتایـان پـێ دەگۆڕێـت. كەواتـە، تـێ گەیشـتن لـە پێكهاتەكانی (ڕووداو) لە واتای بنجیدا بریتیە لە ئەو پێگە پتەوەی كـە توێـژەر لـە سـەری دەوەستێت و لە ئەوێوە سەرنجی گۆڕانكاریەكانی واتا دەدات.

**٢/٢: گلێنەی واتایی:**

جـوانـترین و بـەكارترین سـەرەتا بـۆ بزاڤـی فرەواتـایی بریتیـە لـە دیـاریكردنی كردنی (گلێنەی واتایی) بۆ واتادانەوەی كارەكان. واتە، گلێنەی ئەو واتایەیە كە كـۆنترین و ڕەسەنترین دانەیە و لە ئەو واتایەیشەوە بزاڤی فرەواتـایی دەست پـێ دەكـات. بـۆ نموونـە، كـاری (گـرتـن)، بـە واتـای (مەسك) بـە عـەرەبی، بریتیـە لـە گلێنـەی واتـایی، ئەگـەر ئـەم سیمایانە هەڵ بگرێت

**بكەر (چالاك):** زینـدوو و وزەدار

**بەركار**: چشتێك، گیاندارێك، ...

**كەرەستە**: هەبوونی كەرەستەی گرتن وەك (چنگ، دەست، ...)

**وزە**: بكەری ڕستەكە وزە خەرج دەكات.

**ئەنجام**: پەیوەست بەركار بە بكەرەوە.

**پەیام**: دەشێت پەیامێك هەبێت.



منتدى إقرأ الثقافي

ئـەم واتایـە دەبێـت بـە گلێنـەی واتادانـەوە و وەك (تیشـکۆ)یەك هـەموو واتـا نوێیەکانی پێدا دەڕوات. یان دەبێت بە هەنگاوی ژمارە (سفر) لە پلیکانـەی واتاسـازیدا. بـۆ نموونە، بە پێنگافی ڕۆژگار (بکەر) گۆڕاوە و بوە بە چشتی تـر، یـان (بـەرکار) گـۆڕاوە، یـان کەرەستەی (گرتن) گۆڕاوە، یان جۆری وزەکە گۆڕاوە. دەشـێت لـە کـاری (گـرتن)دا (بکـەر) بـریتی بێـت لـە ئامێرێـك و (بـەرکار) بـریتی بێـت لـە چشـتێك. پاشـان، (دەسـت و چـنگ) بریتیە لە ئەو بەشە تایبەتە بە (گرتن) و وزەکەیش، بریتی بێـت لـە وزەی کارەبـایی، یـان هەر جۆرێکی تر لە وزە.

لە گەڵ هەموو ئەوەیشدا، چەند ئاکارێك هەیە کە (گلێنەی واتایی) لە واتاکانی تر جودا دەکاتەوە، وەك:

**یەکەم**: گلێنەی واتایی ڕووداوی کارەکە دەنوێنێت بە شێوەیەکی ڤیدیۆیی و ڕاستەقینە.

**دووەم**: گلێنەی واتایی، کۆنترین و بنجی ترین واتای کارەکە هەڵ دەگرێت.

**سێیەم**: لە گلێنەی واتاییدا، هـەموو سـیماکانی واتاسـازی بـە پتـەوی دەمێننـەوە و هیچیان شانۆی نواندن نادۆڕێنن.

**چوارەم**: واتای بنجی ئەو واتایەیە کە لـە هـەموو واتـا سـەربارەکاندا لـە ئارادایـە، بـەڵام لـە ڕایەڵەی بەکارهێنانی جیاوازدا.

## ٣/٢: گۆڕان لە سیماکانی واتاسازیدا:

لە نموونـەیەکدا، وەك کـاری (سـووتان)، چـەند سـیمایەکی واتاسـازی پتـەو هەیـە، وەك:

- **بکەر**: سست و بەرجەستەیە و دەبێت بە (سووتەمەنی).
- **ڕەگەزی یاریدەر**: (ئۆکسجین).
- **پاشەرۆك**: دەنگ، گەرمی، ڕوناکی، دووکەڵ، سووتوو.
- **ئەنجام**: گۆڕینی باری سروشتی لە بکەردا.



منتدى إقرأ الثقافي

لە ئەم میکانیزمەدا، یەکێك لە سیماکانی واتاسازی دەگۆڕێت. بۆ نموونە، ئەگەر بەرکاری یەکەم بریتی بووبێت لە (پووش)، دەشێت لە پاشتردا گوێزرابێتەوە بۆ (دار) و ئەمجار بۆ (ڕەژوو: خەڵووز)، یان، لەپاش ماوەیەکی دی بۆ (نەوت) و بۆ دارشتەکانی نەوت. لە ڕاستیدا، ڕۆژ بەڕۆژ سووتەمەنی نوێ دەهێتە کایەوە و واتای پتەوی کاری (سووتان) کاریگەری خۆی پیشان دەدات. واتە، لە هەموو ئەو واتایانەدا هیچ ڕەگەزێکی واتایی لە ناو ناچێت و ڕووداوەکەیش بە جوانی دەنوێنرێت، بەڵام تەنها سروشتی یەکێك لە سیماکانی دەگۆڕێت. ئەمە و لە کاری بنجی (سووتان)دا، وشەکانی (پووش، دار، ڕەژوو، نەوت) بریتین هەم لە (بکەری ڕێزمانی) و هەم لە (بەرکاری واتایی). بێگومان، ئەوە گرنگ نیە، بەڵام گرنگ ئەوەیە کە ڕۆژ بەڕۆژ (بکەر) دەگۆڕێت، وەك: (سووتانی خەرمان، سووتانی ماڵ، سووتانی دارستان، سووتانی ئۆتۆمبیل، سووتانی کارگە، سووتانی ... ).

سەرەڕای ئەوە، لە شیکاری ڕستەیەکدا، وەك: **(دارەکە دەسووتێت)**، دابەشبوونی پێکهاتەکانی ڕستەکە بە ئەم شێوەیە:

**بکەر:** بریتیە لە تشتێکی بسووت (سووتەنی). ئەم بکەرە مەگەر هەر بە ڕێزمان بکەر بێت، چونکە هیچ چالاکییەك نانوێنێت و ملکەچە وەك (بەرکار) لە بەر ڕووداوی کارەکەدا.

**بەرکار:** بکەری ڕستەکە (دارەکە)، هەر چەند بریتی بێت لە (بکەر) بە ڕێزمان، بەڵام بریتیە لە (بەرکار) بە واتا. هەر لە بەر ئەوە، هەندێك کەس کە لە بانێژەی واتاسازییەوە سەیری (بکەر) دەکەن، وا دەزانن کە بریتیە لە (بەرکار)، بەڵام بریتیە لە (بکەری سست).

**ڕەگەزی دەرەکی:** ڕەگەزی ئۆکسجین ( $O_2$) دەچێتە نێو ڕووداوەکە و بەبێ ئەو ڕەگەزە دارەکە ناسووتێت. واتە، ئەگەر هەموو دنیا پڕ بێت لە سووتەمەنی (دار) بە بێ ئۆکسجین بێ کەڵکە، چونکە ئاگر ناگرێت.

**پاشەڕۆك:** سووتوو و خۆڵەمێش و دووکەڵ (گاز)، لە گەڵ وزە لە چەشنی (دەنگ، ڕووناکی، گەرمی). کەواتە، سیستمی (گەرمی) دروست بوە. لە لایەکەوە ئۆکسجین و سووتەمەنی دەچێتە ژوورەوە و لە لایەکی ترەوە وزە و پاشەڕۆك بەرهەم دەهێنرێت.



منتدى إقرأ الثقافي

ئەمانە هەر هەمووی بۆ دیوی تێپەڕی کاری (سووتان) بوو، ئێستایش با دیوە تێپەڕەکەی ئەو کارە ببینین، کە بریتیە لە (سووتاندن)، وەك: (شیلان دارەکە دەسووتێنێت)؛

**بکەر؛** زیندوو و ژیر و چالاك و ڕووداوگێڕ.

**بەرکار؛** چشتێکی بەرجەستە و بسووت (دارەکە)، لە ئەم بەکارهێنانەدا (دارەکە) بە ڕێزمان و بە واتا بریتیە لە (بەرکار). ئەم دیاردەیەیش جودایە لە پێکهاتەکانی کاری (سوتان)، باسکراو لە پێشەوە.

**هۆکاری دەرەکی؛** ڕەگەزی ئۆکسجین پێویستە بۆ بەرێوەچونی ڕوودانی (سووتاندن).

**پاشەرۆك؛** وەك بۆ کاری (سووتان)، لە ئێرەیشدا سووتوو و خۆلەمێش و وزە بەخشین هەیە.

**٤/٢: وردکردنەوەی واتای بنجی:**

لە نموونەیەکدا، وەك: **(ئازاد پارە دەنێرێت)**، ئەگەر لە ئاستی واتای بنجی کاری (ناردن) ڕابمێنین، دەبینین کە پێکهاتەکانی ئاوەها دابەش دەبن:

**بکەر**: (ئازاد) کەسێکی زیندوو و ژیر. واتە، زیندوویەکی ناژیر ناتوانێت ڕووداوی کاری (ناردن) ئەنجام بدات.

**بەرکار**: بەرکارەکە، کە بریتیە لە (پارە)، تشتێکی بەرجەستەیە.

**جێگۆڕین**: بەرکارەکە (پارە) جێ دەگۆڕێت.

**ئاراستەی جێگۆڕین**: خاڵی سەرەتا لە لای بکەر (ئازاد) دەست پێ دەکات بەرەو دوورتر، بەڵام خاڵی کۆتایی دیاری نەکراوە. لە ئەم هەڵوێستەدا، ئەگەر خاڵی کۆتایی دیاری بکرێت، دەبێت کاری سادەی **(ناردن)** بگۆڕین بە کاری ئامرازداری **(ناردن بۆ ... )**. بۆ نموونە، دەشێت خاڵی کۆتایی بریتی بێت لە (شیلان)، وەك: **(ئازاد پارە دەنێرێت بۆ شیلان)**.

**دەستەبەرە**: دەشێت، دەستەبەرەیەك هەبێت بۆ (ناردن)ی پارەکە و ئەو دەستەبەرەیش بریتی بێت لە (پۆستە)، وەك: **(ئازادبە پۆستەدا، پارە دەنێرێت بۆ شیلان)**. ئێستاش، دەتوانین ئەو سێ ڕستەیە بکەین بە پلیکانەیەك، وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

(١): ئازاد پارە دەنێرێت

(٢): ئازاد پارە دەنێرێت بۆ شیلان

(٣): ئازاد، بە پۆستەدا، پارە دەنێرێت بۆ شیلان

بێگومـان، ئەگـەر هـەر واتەیـەکی بنجـی بـە ئـەم چەشـنە شـیتەڵ نەکرێتـەوە، نـاتوانین هـەنگاوی ئەکادیمیانـە بکەینـەوە لـە نێـو رایەڵـەکانی ئـەو واتایانـەدا کـە لـە ئـەم گلێنەیەوە پەیدا دەبن. لە هەردوو رستەی (١ و ٢)دا، هەردوو کاری (نـاردن) و (نـاردن بـۆ) رۆڵ دەگێـڕن. بـەڵام لـە نموونـەی (٣)دا نـاوەلگوزارەی (بـە پۆسـتەدا) بـەکار هێنـراوە و ئەمـەیش هـیچ ناگۆڕێـت لـە (واتـا)ی کـار، چـونکە فەرشـی ئـاوەلگوزارە رادەخـات لـە ژێـر قەوارەی رستەکەدا، وەك:

{بە پۆستەدا (ئازاد پارە دەنێرێت بۆ شیلان)}

**٥/٢: واتای بنجی و واتای پتەو:**

لە واتای بنجی هـەر کارێکـدا، ڕووداوێکـی ڕاسـتەقینە و بـیّ دەسـتکاری هەیـە. بـۆ نموونە، لە پێکهاتەی کـاری (بـڕین)دا، چـەند سـیمایەکی واتاسـازییانە خـۆی دەنوێنێـت لـە ڕووداوەکەیدا، وەك:

- بکەرێکی وزەدار و ژیر (ئەو کەسەی هەڵ دەستێت بە کردەوەی بڕین).
- بەرکارێکی بەرجەستە، کە کردەوەی (بڕین) پەسەند بکات.
- ئامێری (بڕین)، ئامێرێك کە تایبەت بێت بە پرۆسەی (بڕین).
- گۆڕینی ڕوخسار، دەبێت ڕوخساری دەرەوەی بەرکارەکە بگۆڕێت بە کەرتبوون
- پاشـەرۆك، دەشـێت پاشـەرۆکی ڕووداوەکـە هـەبێت، وەك: کەپـەکی بـڕین، دەنـگ بەخشین، گەرمی بەخشین.

لە ڕاسـتیدا، جۆرە واتـای ئاوهـا، بریتیـە لـە واتایـەکی سـەخت و پتـەو، کـە چـەند ئاکارێکی تێدا هەیە، وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

**یەکەم**: ڕووداوی کارەکە زۆر پتەوە و بە شێوەیەکی ڕاستەقینە دەچەسپێت. واتە، هیچ سیمایەکی واتاسازی وندا نابێت لە پرۆسەیەدا.
**دووەم**: ئەم جۆرە واتایە، بە کۆنترین واتا دەژمێردرێت. واتە، لەسەرەتادا ئاوها پەیدا بوە و واتاکەی خۆی چەسپاندوە. لەپاشتردا، ئەگەر گۆڕانکاری هەبووبێت، لە واتاکەدا نەبوە، بەڵکوو لە ئەو پێکهاتانەدا بوە کە واتاکەی پێك دەهێنن.
**سێیەم**: بەپێی خاڵی پێشوو، واتایەکی سەخت و پتەو پەیدا بوە بۆ کاری (بڕین) و لە پاشتردا بەکارهێنانەکانی ئەو کارە کەوتوونەتە بەر گۆڕانکاری.
**چوارەم**: لە هەر نموونەیەکدا کە کاری (بڕین) بەکارهێنرابێت، ئەوا کردەوەی (بڕین) هەیە.

تا ئێستا، واتای سەخت و پتەو (Hard meaning) باسکرا و گوترا: ئەم جۆرە واتایە ڕووداوی کارەکە دەنوێنێت بە هەموو سیماکانیەوە. واتە، هەر کارێك ڕووداوێکی پتەوی تێدا هەیە. لە واتای سەرباردا، یان لە ئەو واتایانەدا کە لە واتای بنجییەوە پەیدا دەبن، هەڵوێستەکە زۆر زۆر جیاوازە و ناتوانین بڵێین: ڕووداوەکەی سفتە، یان بڵێین: (Soft meaning) لە ئارادایە. بۆ نموونە، کاری (بڕین) لە واتای بنجیدا ڕووداوی ڕاستەقینە هەڵ دەگرێت و لە واتایەکی (سەربار)یشدا هەڵی دەگرێت. لە ڕاستیدا، کاری (بڕین) لە (جل بڕین، پرچ بڕین، خشت بڕین)دا واتاکەی تەسك دەبێتەوە بۆ (بڕین)ێك بە دەستی (وەستایی) و لە سەر (ئەندازە) و (پێوانە). بێگومان، ئەخشە و پێوانەی بەرکارەکانی (جل، پرچ، خشت) ستایلی بڕینەکە دەسەپێنن بە سەر واتای کارەکەدا.

**٦/٢: بنجی کار، تیشکۆی واتایی:**

لە هەموو چاوگێکی بنجیدا، ئەگەر نیشانەی ڕابردوو و نوونی چاوگ بقرتێنین، ئەوا ئەو بەشەی کە دەمێنێتەوە بریتیە لە (بنجی چاوگ)، یان (بنجی کار)، وەك: (سووتان: سووت، ترسان: ترس، گرتن: گر ، بڕین: بڕ، کوشتن: کوژ). بە سەرنجێکی ورد لە ئەو کارانە، دەبینین بە لابردنی نیشانەی ڕابردوو و نوونی چاوگ، بنجەکان بەجێ



منتدى إقرأ الثقافي

دەمێنن، وەك (سووت، ترس، گر، بڕ، کوژ). لە ڕاستیدا، ئەم وشانە هەرچەندە بێ بڕشت بن، یان کەم بڕشت بن لە بەکارهێناندا، یان، وشەی سەربەخۆ نەبن، کەچی بریتین لە (تیشکۆی واتایی). واتە، ئەو جێگەیەی کە گشت توخمەکانی واتای ڕستەکەی تێدا کۆ دەبێتەوە، چونکە:

**یەکەم**: لابردنی گۆکراوی (بنج) لە هەر ڕستەیەکدا، یان لە هەر جێیەکدا کە هەبێت، دەبێت بەهۆی وێرانبوونی واتای ئەو کارە.

**دووەم**: لە پاش لابردنی بنجی کار هیچ چشتێك بەجێ نامێنێت کە کەڵکدار بێت. کەواتە، لابردنی بنجی (سووت) دەبێت بەهۆی وێران بوونی قەوارەی وشەکە، یان قەوارەی ڕستەکە، چونکە دەبێت بە قاوغێکی کلۆر.

**سێیەم**: بە کورتی، کە (بنج) نەما، (کار) نامێنێت، کە (کار)یش نەما، (رستە) نامێنێت، کە (رستە)یش نەما دەقی (ئاخاوتن) نامێنێت. کەواتە، سەردەق و سەرتۆپی ئاخاوتن بریتیە لە (بنجی کار)، چونکە هەم واتای رستەی و هەم ڕێزمانی رستە لە سەری دەگەڕێن.

بێگومان ئەوەی گوترا ئەوە دەگەیەنێت کە بنجی کار بریتیە لە تیشکۆی واتادانەوە و ئەو تیشکۆیەیش دەبێت بە (گلێنە)یەك بۆ ئەو واتایانەی کە لە پاش واتای بنجی پەیدا دەبن.

**٢/٧: ئامارێك بۆ سیماکانی واتاسازی:**

لە پێناوی ئەو ئامانجەدا کە بتوانین کێشەی واتاسازی گەمارۆ بدەین، دەست دەبەین بۆ لیستی چاوگە بنجیەکان و (١٠) کاری (تێنەپەڕ) و (١٠) کاری (تێپەڕ) هەڵ دەبژێرین. بێگومان، ئەم ژمارەیە زۆرە و وا دەکات کە ڕووبەڕێکی گەورە ڕووماڵ بکەین و بگەین بە زۆربەی زۆری نهێنیەکانی واتاسازی لە کاری زمانەکەدا. واتە، ئەو کارە جۆراو جۆرانە ناچارمان دەکەن کە زۆر بگەڕێین و زۆر ڕوو بە ڕوو ببینەوە لە گەڵ جۆرە واتایەکدا کە ئێمە هەستمان پێ نەکردبێت. پاشان، لە ئاستی هەر کارێکدا، هەموو سیما و



منتدى إقرأ الثقافي

ئاكارە واتاییەكان ڕیز دەكەین. لە كۆتایی ئەم بەشەدا، دەتوانین لیستەیەك دروست بكەین بۆ هەموو ئەو ئاكارانەی كە ڕژێمی واتایی پێك دەهێنن لە ڕێزمانی كاردا، وەك:

**یەكەم: لیستی كاری (تێنەپەڕ):**

**(١): پچڕان:**

بكەر (سست): چشتێكی بەرجەستەیە (پەت، دەزوو ...)

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (پچڕاندن)

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی ڕوخساری بكەر بە دوو لەت بوون.

**(٢): بزركان:**

بكەر (سست): گێراوەیەك (ماست، شیر ...)

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (بزركاندن)

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی باری پێكهاتەیی (كیمیاوی) بەرەو بێكەڵك بوون.

**(٣): ترازان:**

بكەر (سست): چشتێكی بەرجەستە

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (ترازاندن)

ئەنجامی ڕووداو: جودا بوونەوەی (بكەر) لە لایەنێك.

**(٤): ترسان:**

بكەر (سست): زیندوو

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (ترساندن)

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕانی باری دەروونی (تێك چوونی باری دەروونی).

**(٥): ڕووخان:**

بكەر (سست): چشتێك



منتدى إقرأ الثقافي

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (رووخاندن)

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی بنیاد و فرێدانی ماتەوزە.

**(٦): سووڕان:**

بكەر (سست): چشتێكی بەرجەستە.

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (سووڕاندن)

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی جێگای خاڵێك بەڕادەی چەقی سووڕانەوە.

**(٧): ڕۆیشتن:**

بكەر (چالاك): زیندوو و وزەدار.

ئەنجامی ڕووداو: جێ گۆڕین بەرەو دوورتر.

**(٨): مردن:**

بكەر (سست): زیندوو.

بكەری (چالاك): تایبەتە بە دیوی (ئاندن)، وەك: (مراندن)

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی باری (بكەر) بۆ باری (بێ گیان)

**(٩): هاتن:**

بكەر (چالاك): زیندوو.

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی جێگای (بكەر) بەرەو ئاخێوەر.

**(١٠): فڕین:**

بكەر (چالاك): زیندوو

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی جێگای (بكەر) لە زەوی بۆ ئاسمان.



منتدى إقرأ الثقافي

**دوەم: لیستی كاری (تێپەڕ):**

**(١): پێوان:**

بكەر (چالاك): زیندو و ژیر.

بەركار: چشتێك كە پێوانەگر بێت.

دەستەبەرە: ئامرازی پێوانە.

ئەنجامی ڕووداو: زانیاری پتەو لەسەر بەركار (زانیاری چەندایەتی).

**(٢): پێكان:**

بكەر (چالاك): زیندو و ژیر.

بەركار: چشتێك كە بكرێت بە (نیشانە).

دەستەبەرە: بەرد، گوللە، تیر، رم، ...

ئەنجامی ڕووداو: گەیشتنی بكەر بە (بەركار).

**(٣): كێڵان:**

بكەر (چالاك): زیندو و ژیر.

بەركار: زەوی (بۆ كێڵان).

دەستەبەرە: كەرەستەی كێڵان، خاكەناز، بێڵ، پاچ، گاسن، هەوجاڕ.

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕینی دۆخی بەركار.

**(٤): بەستن:**

بكەر (چالاك): زیندو و ژیر.

بەركار: چشتێك كە ببەسترێت.

دەستەبەرە: كەرەستەیەك بۆ بەستن، پەت، دەزوو، گوریس ... هتد.

ئەنجامی ڕووداو: گۆڕنی دۆخی بەركار (جێگیركردن)



منتدى إقرأ الثقافي

**(٥): بيستن:**

بكەر (چالاك): زيندو و ژير.

بەركار: دەنگی گۆكراو

دەستەبەرە: گۆئەندامی بيستن.

ئەنجام: هەست كردن بە (بەركار)، هەستياری بە گوێ.

**(٦): خستن:**

بكەر (چالاك): هەر سەرچاوميەكی وزە.

بەركار: چشتێك كە ماتەوزە هەڵ بگرێت.

دەستەبەرە: دەسەبەرەيەك بۆ (خستن)، وەك: (هێزی دەست، هێزی رەشەبا و زريان).

ئەنجام: گۆڕينی جێگەوتی (بەركار)، بە كەم كردنەوەی ماتەوزە.

**(٧): فرۆشتن:**

بكەر (چالاك): زيندو و ژير.

بەركار: چشتێك كە بكرێت بە (فرۆشتە)

دەستەبەرە: پارە، يان چشتێكی بەرجەستە.

ئەنجام: گۆڕينی خاوەن لە بەركاردا لە (بكەر)ەوە بۆ كەسێكی دی.

**(٨): گرتن:**

بكەر (چالاك): زيندو و ژير.

بەركار: چشتێكی بەرجەستە بۆ گرتن.

دەستەبەرە: كەرەستەی گرتن، دەست، چنگ .

ئەنجام: پەيوەستبوونی بكەر و بەركار پێكەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**(٩): ژماردن:**

بكەر (چالاك): زیندو و ژیر

بەركار: چشتێكی دانە دانە.

دەستەبەرە: كەرەستەیەك بۆ ژماردن (دەست، پەنجە، چاو، ...).

ئەنجام: زانینی زانیاری پتەو لەسەر بەركار (زانیاری لەسەر چەندایەتی).

**(١٠): بینین:**

بكەر (چالاك): زیندو و ژیر.

بەركار: چشتێكی بەرجەستە.

دەستەبەرە: كۆئەندامی بینین.

ئەنجام: هەست كردن بە (بەركار)، هەستیاری بە چاو.

**٨/٢: یەك ڕوخسار و دژواتا:**

لە ئەو سەرچاوانەی بەردەستدا، نموونـەی ئاوەهامـان دەسـت نەكـەوت، كـە یـەك ڕوخساری هەبێت، بەڵام دوو واتا ببەخشێت كە دژیەك بن. لـە نووسـینەوەی ئـەم كتێبـەدا نموونەیەك وە دەست كەوت[٩]، وەك:

(١): (سووتان)ی گڵۆپ: ڕووناكی بەخشین

(٢): (سووتان)ی گڵۆپ: وەستان لە ڕووناكی بەخشین

[٩] لـە بـەر گرنگـی بابەتەكـە، ئـەم نموونەیـە لـە چـەند جێیەكـدا باسـكراوە. یەكـەم جـار، لـە گۆڤـاری ( ڕۆشـنبیری كوردسـتانی)دا بڵاوكراوەتـەوە، ژمـارە (٢)، سـاڵی ٢٠٠٠. دواتـر، كـراوە بـە بابـەتی (هەشـتەم) لـە كتـێبی (چـەند بابەتێكی ناوازە لە ڕێزمانی كوردیدا/ ٢٠١٦).



منتدى إقرأ الثقافي

بێگومان، ئـەم دیاردەیـە لـە بزاڤی واتادانـەوەوە هـاتوە، بـەڵام لـە دوو جەمسـەری جیاوازەوە، وەك:

| لە کاتی سووتاندا | لە پاش سووتان |
|---|---|
| پووش ، ئاگر | بوون بە سووتوو |
| ڕووناکی بەخشین | وەستان لە ڕووناکی بەخشین |
| ڕەنگی ڕووناك | ڕەنگی ڕەش |
| کەلکدار | بێ کەڵك |

واتای ڕستەی (١) لە واتادانـەوەی لای ڕاسـتەوە سەرچاوەی گرتـوە. بـەڵام واتـای ڕستەی (٢) لە واتادانەوەی لای چەپەوە هاتوە. ئەوەیش لە یـاد نەکـەین کـە لـە هـەردوو لای خشتەکەدا واتای کاری (سووتان) دەدۆمێت، بەڵام ئەم دژواتاییە لە واتادانەوەی هـەر دوو جەمسەرەکەوە پەیدا بـوە. گومـان لـە ئەوەدانیـە کـە بـەردەوامبوونی (سـووتان) لـە سووتەمەنیدا واتای (ڕووناکی بەخشین و کەڵکداری) دەداتەوە، بەڵام واتای کۆتایی هاتنی سووتانەکە (بوون بە سـووتوو) واتـای (بـێ کـەڵك بـوون و ڕەش بوونـەوە) دەداتـەوە. بـە ڕاستی، لە ئەم نموونـە دەگمـەن و ناوازەیـەدا، دەمکـاتی ڕسـتە واتـای ڕسـتەکە دەکـات بـە پێچـەوانە. لـە نموونەکانـەی دەسـتە ڕاسـتدا، واتـای (ڕوونـاکی بەخشـین) زاڵـە، بـەڵام لـە نموونەکانەی دەستە چەپدا، واتای (تاریکی بەخشین) زاڵە. هۆی ئەوەیش ئەوەیە کـە لـە نموونەکانی (دەستە ڕاست)دا پێشکاری بەردەوامی (دە) هەیە و کـاری کـردوە لـە واتاکـە، بەڵام لە نموونەکانەی دەسـتە ڕاسـتدا، ئـەو پێشکارە ئامـادە نیـە. کەواتـە، نـەك دەمکات ڕستە، تەنانەت مۆرفیمێکی ڕێزمانی، وەك (دە)، باندۆر و تەشەنەی خۆی زاڵ دەکات بـە



منتدى إقرأ الثقافي

سـەر واتادانـەوەدا و پردێکی خزمایـەتی پیشان دەدات لـە نێـوان ڕێزمـان و واتاسـازیدا، نـەخشەی (١/٢).

| واتای (بەردەوام بوون) | واتای (وەستان) |
|---|---|
| گڵۆپەکە دەسووتێت | گڵۆپەکە سووتا |
| گڵۆپەکە دەسووتا | گڵۆپەکە سووتابوو |
| | گڵۆپەکە سووتاوە |

نەخشەی (١/٢): کاریگەری پێشگری بەردەوامی (دە)

لە سەر واتای کاری (سووتان)

لەلایـەکی تـرەوە، کـاری (چـەککردن) دەبـا واتـای (پـڕ چـەك کـردن) ببەخشـێت، کەچی واتـای (بـێ چـەك کـردن) دەبەخشـێت. بەرانبـەر بـە ئـەم دیاردەیـە، واتـای (چـەك کردن)ی پێڵاویش هەیە، واتە نوشتاندنەوەی بەشی پشتەوەی پێڵاو بۆ ئـەوەی بـە شـێوەی سۆل لەپێ بکرێت. واتای (بێ چەك کردن) لە واتای (چەك کردن)ی پـێڵاوەوە نزیـك تـرە، چونکە هەردوویان، بە مەبەستی (سووك کردن و بێ بایەخی) ئەنجام دەدرێن.

**٩/٢: سروشتی بکەر لە واتای بنجیدا:**

بە شێوەیەکی گشتی (بکـەر) لـە کـاری تێنەپـەڕدا سست و بـێ وزەیـە. واتـە، نـەو بکەرە، وەك (بەرکار) بە ملکەچی لەبەر ڕووداوی کارەکەدا دەوەستێت، بە بێ ئـەوەی هـیچ بەشداریەك لە خۆیەوە هەبێت. بۆ نموونە، کـە دەڵـێن: (پشـیلەکە تـرسـا، منداڵەکـە ڕەنجـا، پەتەکە پسا)، دەبینین کە بکـەرەکان جیـاوازن لـە ڕووی سسـتی و چـالاکیەوە. لـە نموونـەی یەکەمـدا، پشـیلەکە زینـدوە، بـەلام هـیچ بەشـداریەکی نیـە لـە ڕووداوەکـەدا. یـان بکـەری (منداڵەکە)، کە زینـدوە و دەشـێت بڵێین ژیرە، هیچ چالاکیەکی نیە. بـە واتایـەکی دی، ئـەم بکەرانـە هـەر هـەموویان وەك (بـەرکار) بـە ملکەچـی و گوێڕایـەڵی وەسـتاون و ڕووداوی



منتدى إقرأ الثقافي

کارەکان ئەوان هەڵ دەسووڕێنێت، نەك ئەوان ڕووداوی کارەکە هەڵ دەسووڕێنن. کەواتە، هەردوو بکەری (پشیلەکە) و (منداڵەکە) لە ئەو ڕووداوانەدا، وەك بکەری (پەتەکە)، لە بەر ڕووداودان و هیچ بزاڤێك نانوێنن، یان هیچ وزەیەك خەرج ناکەن لە ڕووداوی کارەکاندا. هەر چەند زیندوو و ژیر و چالاك بن. بەرانبەر بە ئەوەی گوترا، دەبینین هەندێك کاری (تێنەپەڕ) هەیە کە بکەرەکەیان خۆی ڕووداوی کارەکە دەگێڕێت و وزە خەرج دەکات، تا ڕووداوەکە بەردەوام بێت، وەك: (منداڵەکە هات، پاسەوانەکە ڕۆیشت، چۆلەکەکە فڕی). ئەو بکەرانەی کە لە ئەو نموونانەدا بە کارهێنراون، زیندوو و چالاك و وزەدارن و خۆیان وزە خەرج دەکەن، تا ڕووداوی کارەکە بڕوات بەڕێوە. بە واتایەکی دی، ئەگەر بکەری (منداڵەکە، پاسەوانەکە، چۆلەکەکە)، برسی و بێ وزە بن، ئەوا ڕووداوی کارەکان دەوەستێت. بە ئەم پێیە، لە ڕووی وزە خەرجکردنی بکەرەوە، دەتوانین کاری تێنەپەڕی زمانەکە دابەش بکەین بە سەر دوو پۆلدا:

**یەکەم**: (کارە بکەرسستەکان)، یان پۆلە گەورە و پان و پۆڕەکە، وزە خەرج ناکەن و ڕووداو ناگێڕن. ئەم دیاریەیش، زۆربەی هەرە زۆری کارە تێنەپەڕەکان دەگرێتەوە.

**دووەم**: (بکەرچالاك)، یان پۆلە بچووکەکە، ئەو کارانەی کە بکەرەکەیان وزە خەرج دەکات و ڕووداو دەگێڕێت. ئەم پۆلە تەنها و تەنها چەند کارێك دەگرێتەوە. ئەو کارانەش پێیان دەگوترێت (کارەکانی بزووتن).

سەبارەت بە بەراورد، هەموو کارەکانی پۆلی یەکەم چاوگی (ئاندن) پەسەند دەکەن، وەك: (پچڕان: پچڕاندن، بزرکان: بزرکاندن، پسان: پساندن، ترازان: ترازاندن، خشان: خشاندن، ڕەنجان: ڕەنجاندن، ڕووخان: ڕووخاندن، سازان: سازاندن، ...)، کەچی، کارەکانی پۆلی دووەم، چاوگی (ئاندن) پەسەند ناکەن و ئەگەر بە ناچاری پەسەندیان کرد، ئەوا (ناڕێکی) ڕوودەدات لە ڕێزمانەکەدا، وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

- هاتن: هێنان، ئانین، هانین.

- ڕۆیشتن: ڕواندن، ناردن.

- چوون: چواندن، (دەرچواندن)، (دەرچاندن).

لە ئەم هەڵسووڕاندنەدا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم**: کاری (هاتن) بە (هێنان) دیوی تێپەڕی بۆ پەیدا دەکرێت، هەر چەندە ڕوخساری (هێنان) لە سەربەخۆ دەچێت و لە ئەوە ناچێت کە لە (ئاندن)ەوە وەرگیرابێت. ڕوخساری ئانین (بادینان) و هانین (سلێمانی) نزیکترن لە ئەوەی کە لە (ئاندن) بچن، بە مەرجێك کە دەنگی (د) کلۆر کرابێت.

**دووەم**: کاری (ڕۆیشتن)، زۆرتر بە کاری (ناردن) یان بە (بردن) پارسەنگ دەکرێت. لە ئەم دواییەدا، ڕوخساری نامۆی (ڕواندن) پەیدا بوە، وەك: (با ئیشەکە بڕوێنین). ئەم ڕوخسارە زۆر ناوچەییە و زۆرجار بۆ کار و باری فەرمی بەکار دەهێنرێت. لە گەڵ ئەوەیشدا، (ڕواندن) لە ڕەسەندا، بریتیە چاوگی ئاندن بۆ کاری (ڕوان)، بە واتای (سەوزبوون : سەوزکردن).

**سێیەم**: زۆر جار کاری (چوون) بە زۆر دەکرێت بە (چواندن)، بە تایبەتی لە ڕوخساری (دەرچوون)دا، کە دەکرێت (دەرچواندن). ئەم کارە لە هەندێك جێدا کەوتوەتە بەر ئەتیکێتی ناوچەیی و بوە بە (دەرچاندن)، وەك: (مامۆستای فیزیا شیلانی دەرنەچاندوە).

**چوارەم**: وەك کورتەیەك بۆ ئەو سێ خاڵەی سەرەوە، دەتوانین بڵێین: کاری تێنەپەڕی (بکەرچالاك)، چاوگی (ئاندن) پەسەند ناکات، مەگەر بەزۆر، چونکە لە ڕەسەنەوە چاوگی (ئاندن) تایبەتە بە کاری تێنەپەڕی (بکەرسست).

**پێنجەم**: ئەگەر سەرنج بدەین لە دوو نموونە، یەکێکیان لە کاری تێنەپەڕی ئاسایی و ئەوی دی لە کاری تێنەپەڕی بزووتن، وەك: (دارەکە سووتابوو، شیلان ڕۆیشتبوو)، دەبینین لە ڕستەی یەکەمدا، بکەری (دارەکە) وەك (بەرکار) ڕووداوەکە دەگەڕێت لە سەری، کەچی لە ڕستەی دووەمدا، بکەرەکە (شیلان) هیچ واتایەکی (بەرکار) نابەخشێت.



منتدى إقرأ الثقافي

ئەمـەیش وا دەكـات كـە بتـوانین هـەردوو پۆلەكـەی كـاری تێنەپـەڕ لـە یـەكتری جـودا بكەینەوە. لە كاری (سووتان)دا، ڕووداوی كارەكە (بكەر)ی ڕستەكە دابین دەكات، كەچی لـە كاری (هاتن)دا بكەری ڕستەكە ڕووداوی كارەكە دابین دەكات.

**شەشەم**: ڕێژەكانی (بكەری نادیار)، وەك تێنەپەڕن، لە نەو پۆلە دەچن كە دووداوی كارەكە (بكەر) دابین دەكات، نەك پێچەوانەكەی.

**١٠/٢: فرێدانی دەستەبەرەی دوودان:**

لـە كارێكـدا وەك كـاری (گـرتن)، كـە بـە بزافـی (فرەڕوخساری) دەبێـت بـە (هـەڵ گرتن)، ئەم سیمایانە هەن:

- بكەر: زیندوو (وزەدار)
- بەركار: چشتێكی بەرجەستە
- دەستەبەرە: هەبوونی (چنگ، دەست، ...هتد) بۆ هەڵ گرتن
- وزە: بكەر بریتیە لە سەرچاوەی وزە

جێ گۆڕان: بەرزكردنەوە بەرەو سەرەوە

بۆ نموونە، دەگوترێت:

(١): بەردەكە هەڵ بگرە (بە دەست)

یان، دەگوترێت:

(٢): نەخشەكە هەڵ بگرە ( بە دەست)

یان، دەگوترێت:

(٣): نەخشەكە هەڵ بگرە ( بەچاو)

لە نێوان ئەو ڕستانەدا، هەندێك سیمای واتاسازی گۆڕاوە. بـۆ نموونـە، لـە نێـوان ڕستەی (١) و (٢)دا بەركاری (بەردەكە) بوە بە (نەخشەكە)، یـان لـە نێـوان ڕسـتەی (٢) و (٣)دا دەستەبەرەی (بە دەست) بوە بە (بە چاو). ئەمە گرنگ نیە، چونكە لە ژێر سێبەری



منتدى إقرأ الثقافي

مێکانیزمی (گۆڕان لە سیمای واتاسازیی)دا جێی دەبێتەوە. واتە، تەنها و تەنها بەرکارەکە و دەستەبەرەی ڕووداوەکە گۆڕاوە بۆ جۆرێکی دی، وەك (هەڵ گرتن بەدەست) بوە بە (هەڵ گرتن بەچاو). لە ئەم ئاستەدا، وەك دەگوترێت: (نەخشە هەڵ گرتن بە چاو)، دەتوانرێت بگوترێت: (جێپێ هەڵ گرتن بە چاو). لە ئەم ڕستەیەی دواییدا، ئەگەر دەستەبەرەی (هەڵ گرتن بەچاو) لاببەین، چاوگێك بە جێ دەمێنێت لە چەشنی (جێ پێ هەڵ گرتن)، وەك: (ئازاد جێ پێی دزەکەی هەڵ گرت)، کە هیچ پەیوەندیەکی نیە بە واتای بنجی کاری (هەڵ گرتن)ەوە، چونکە (جێپێ) بە چاو هەڵ دەگیرێت، نەك بە دەست.

**١١/٢: واتادانەوە بە (کرتاندن):**

بۆ نموونە، کە دەگوترێت: (چراکە دەسووتێت) دیاردەی (کرتاندن) چەسپاوە، چونکە دەبا بگوترابا: (پلیتەی چراکە دەسووتێت)، یان: (نەوتی نێو پلیتەی چراکە دەسووتێت). لە ئەو نموونەیەدا، ڕووداوی پتەوی کاری (سووتان) هەیە، بەڵام هەندێك لە وشەکان کرتێنراون، وەك (نەوت، پلیتە، ...). هۆی ئەم دیاردەیەیش دەگەڕێتەوە بۆ کورتبڕی و بۆ تیۆری پاشەکەوتی وزەی ئاخاوتن. سەرەڕای ئەم دیاردەیە، چەندین دیاردەی دی هەیە، کە بەشێك لە پێکهاتە کرۆکیەکانی کارەکە دەکرتێنرێت، وەك:

دیوار (ـــ) کردن ← دیوار (دروست) کردن

خانوو (ـ) کردن ← خانوو (دروست) کردن

لە ئەو ڕستانەدا، پێشکاری (دروست) بوە بە واتاگۆڕ و واتای کاری (کردن) دەگۆڕێت بۆ (دروست کردن) پاشان، کاری (دروست کردن) تەرخان کراوە بۆ بەرکارێکی واتا بەست، وەك (دیوار، خانوو). لە پاشتردا، واتاگۆڕی (دروست) کرتاوە و کاری (دیوار کردن. خانوو کردن) پەیدا بوە. لە جیاتی (دیوار دروست کردن، خانوو دروست کردن).



منتدى إقرأ الثقافي

**١٢/٢. كارى ياريدەدەر بۆ كارێكى تر:**

**هەندێك لە كارى زمانەكە گيانى ياريدەدانى واتايى هەڵ دەگرن هەر لـە بنجـەوە. بۆ نموونە، كارى (توانين) دەتوانێت جارێك ببێت بە ڕووداوێكى ڕاستەقينە و جـارێكى تـر ببێت بە كارێكى ياريدەدەر بۆ كارێكى تر، بە ئەم چەشنە:**

**يەكەم:** ڕووداوى ڕاست و چەسپاو:

**بەرد توانين: وەك (ئەو بەردە دەتوانم)**

**لە ئەم ڕستەيەدا، گيانى تێپەڕيى واتايى بە ڕێزمان و بە واتـا ئاشـكرايە و بكـەرى ڕستەكە وزە خەرج دەكات لە ئەنجام دانى ئيشەكەدا.**

**دووەم:** ڕووداوى واتايى:

**تواناى هەڵ گرتن: (من دەتوانم ئەو بەردە هەڵ بگرم)**

**لە ئێرەدا جۆرە ياريدەيەكى واتايى پەيدا بوە. چونكە (توانين)ى ڕاسـتەقينە بـوە بە (توانين)ى واتايى. بە كورتى، دەتوانين بڵێين: ئەم كارە لە واتاى بنجـى پـاك بوەتـەوە و ڕۆيشتوە بەرەو واتايەكى تر كە بزافى ياريدەدانى واتايى هەڵ دەگرێت.**



منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی سێیەم
## واتـاگۆڕکیٚ بە مۆرفیمی واتـاگۆڕ

### ١/٣: گۆڕینی ڕوخسار و بڕشتی واتایی:

بڕشتی ڕوخسار لە کاردا بریتیە لە توانـای زۆر کردنـی ڕوخسارەکانی کـار بـۆ بـە کار هێنانیان لە واتای نوێدا. ئەمە و کـار هەیـە لـە ڕووی ڕوخسارەوە بـێ بڕشـتە و هەیـە بڕشتی زۆرترە. بۆ نموونە، کاری (تۆران) ناتوانێت ببێت بە دارێژراو، مەگەر بە زۆرەملـێ، وەك: (هەڵ تۆران*، داتۆران*، یان تۆرانەوە*). ئەم ڕوخسارانە هەر چەنده هەبن، بەڵام بـێ بڕشتی واتایین، چونکە واتایەکی نوێ داناهێنن. بەرانبەر بە کاری (تۆران)، کاری تـر هەیـە کـە زۆر بـە بڕشـتن، وەك (گـرتن، کـەوتن، کـردن، بـڕین، ...). بـۆ نموونـە، کـاری (گـرتن) دەتوانێـت ئـەم ڕوخسـارانە ببەخشـێت. (هـەڵ گـرتن، ڕاگـرتن، داگـرتن، هـەڵ گرتنـەوە، داگرتنـەوە، ڕاگرتنـەوە، بـەرگرتن، سـەرگرتن، وەرگـرتن، بەرگـەگرتن، خـۆگرتن، ...). ئـەم ڕوخسـارانە، کـە بـە بڕشـتی ڕوخسـاری کـاری (گـرتن) هاتوونەتـە ڕیـزەوە، هـەر یـەکێکیان بریتیە لە یەکەیەکی واتا بەخش لە زمانەکەدا، بـەڵام هـەر دانەیـەك لـە ئەوانـە واتایـەکی بنجی (دوەم) دادەهێنێت. کەواتە، هەر یەکێك لە ئەو ڕوخسارانە بۆی هەیـە کە ببێـت بـە (گلێنەی واتادانەوە) و چەندین واتای نوێ ببەخشێت بە زمانەکە. ئەمـە و بڕشـتی واتـایی لە هەموو کاری زمانەکەدا هەیـە، بـەڵام بـە ڕادەی جیـاواز. بـۆ نموونـە، ئەگـەر کارێـك بـێ بڕشتی واتایی بێت لە ئەم سەروەختەدا، دەشێت لە سەردەمێکی تردا بکەوێتـە بـەر بزاڤـی واتادانەوە. بۆ نموونە کاری دارێژراوی (هەڵ گرتن) چەند واتایـەك دەداتـەوە، وەك: ( دەم وچاو هەڵگرتن، ئافرەت هەڵگرتن، ڕێ هەڵگرتن). ئەم ڕوخسارانە لە ئاستێکی بـەرزدان بـۆ بڕشتی واتایی، بەڵام ئەوەی جێی سەرنجە لە ڕوخساری (هەڵ گرتن)دا، ئەوەیە کە بڕشتی واتایی نامرێت و لە داهاتوویشدا دەشێت چەند واتـای تـر پەیـدا بکـات و هەنـدێك واتـایش ڕەنگە بپوێنەوە. وەك نموونە، کاری (بەزین) واتادارە. بـەڵام (بەزینـەوە) و (هـەڵ بـەزین) بێ واتا و سستن، کەچی (هەڵ بەزینەوە) جارێکی تـر واتـادارە. کەواتـە، لـە ئـەم بازدانـەدا پلەیەکی واتاکە ئاودیو بوە. یان، لە یەکێك لە ئەو دوو گلێنەی واتاییـە ئـاودیو کـراوە، یـان (بەزینەوە)، یان (هەڵ بەزین).



منتدى إقرأ الثقافي

**٢/٣: خانەکانی واتا گۆڕین:**

**لە پلیکانەی کاردا سێ خانە هەیە کە مۆرفیمی واتاگۆڕ هەڵ بگرن، وەك:**

**یەکەم:** خانەی پێشگری واتاگۆڕ (+٣)

**دووەم:** خانەی بەرکار (+٥)

**سێیەم:** خانەی پاشگری دووپات کردنەوە (ەوە)، لە خانەی (- ٨)دا.

ئەمە و مۆرفیمەکانی واتاگۆڕکێ لە چەندین کۆمەڵەی پۆلێنکراو پێکهاتوون و خشتەڕێژیش کراون. لەلایەکی ترەوە، مەرجیش نیە هەموو کارەکان ئەو پێشگرانە وەربگرن. یان، مەرج نیە ئەگەر کارێك وەری بگرێت، هەر یەك پێشگر وەربگرێت. یان، هەر کاتێك کە پێشگرێك بە کار هات، ئەوا واتای کارەکە دەگۆڕێت، چونکە روخسارەکەی دەگۆڕێت. سەرەڕای ئەوە، پێشگرەکان جێگۆڕ نین و لە ریزی خۆیان ناترازێن.

**٣/٣ پێشگری واتاگۆڕ لە خانەی (+٣)دا:**

لە پلیکانەی کاردا، لە خانەی (+ ٣)دا پێشکاری واتاگۆڕ هەیە، بەڵام ئەم مۆرفیمە واتاگۆڕانە هەمە جۆرن و زۆر بە ئاڵۆزی دەردەکەون لە ڕێزماندا. لە ئەم هەڵوێستەدا، دەبێت پۆلینیان بکەین، وەك:

**پۆلی یەکەم: پێشکاری واتاگۆڕ (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ)**، نەخشەی (١/٣).

| پێشکار | نموونە |
|---|---|
| هەڵ | هەڵ گرتن، هەڵ کەوتن، هەڵ دان، هەڵ نان، هەڵستان، ... |
| دا | داگرتن، داکەوتن، دادان، دانان، ... |
| ڕا | ڕاگرتن، ڕادان، ڕامان، ڕابوون، ... |
| ڕۆ | ڕۆکردن، ڕۆبوون، ڕۆنان، ڕۆنیشتن، ... |

نەخشەی (١/٣): پێشگری واتاگۆڕ (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ)[١٠]، بە نموونە.

[١٠] بۆ ئاسانکاری لە فێرکردندا، دەشێت ئەم پۆلە پێشگرە ناوبنرێت: (هەڵداراڕۆ)، واتە پێکەوە بخوێنرێنەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

لە ڕووی واتاسازیەوە، ئەم چوار پێشگرە، بە زۆری تەشەنەی ئاراستەگری دەبەخشن بە ڕووداوی کارەکە، بە ئەو چەشنەی کە لە سەر نەخشەی (٢/٣) نیگارکراوە.

| واتاگۆڕ | هێما و ئاراستە | نموونە | ئاراستەگری |
|---|---|---|---|
| هەڵ | | هەڵ گرتن | ↑ |
| دا | | داگرتن | ↓ |
| ڕا | | ڕاگرتن | →□← |
| ڕۆ | | ڕۆکردن | ↲ |

نەخشەی (٢/٣): ئاراستەی پێگشگرەکانی (هەڵ، دا، ڕا، ڕۆ).

ئەم پۆلە پێشگرە، چەند ئاکارێك هەڵ دەگرن، وەك:

**یەکەم**: بڕشتی (فرەڕوخساری)یان لە هەموو پۆلەکانی دی بەهێزترە. واتە، نموونەیان زۆرە و واتای زۆر لە کارەکانیان گۆڕیوە.

**دوەم**: ئەو پێشگرانە هەر چەند بە گشتی زۆر بەبڕشترن، بەڵام لە نێوان خۆیاندا، جیاوازیان هەیە. لە ئەم ڕووەوە، پێشکاری (هەڵ) زۆر بەربڵاوە و پێشکاری (دا) کەمتر و پێشکاری (ڕا) نەختێك کەمتر و پێشکاری (ڕۆ) کەمترین.

**سێیەم**: وەك هەردوو پێشکاری (هەڵ) و (دا) بڕشتیان زۆرترە، زۆرجار دەتوانرێت بە ئاسانی بخرێتە سەر هەندێك (کار)، کە وەری ناگرن، وەك:

| | | |
|---|---|---|
| تۆڕان | هەڵ تۆڕان | تۆڕان بە توورە بوون و هەڵ ستانەوە |
| | داتۆڕان | تۆڕان بە لووت شۆڕکردنەوە |

**چوارەم**: نموونە زۆر کەمە لە ئەو کارانەی کە ئەم چوار واتاگۆڕە پەسەند بکەن. بەڵام لە کاری (بوونی بوونایەتی)دا ئەو دەرفەتە دەڕخسێت، نەخشەی (٣/٣)



منتدى إقرأ الثقافي

| | | |
|---|---|---|
| بوون | هەڵ بوون | گلۆپەکە هەڵ بوو |
| | دا بوون | ئێمە دانابین |
| | ڕا بوون | شیلان ڕابوو |
| | ڕۆ بوون | ئاوەکە بووبوو |

نەخشەی (٣/٢): بڕشتی واتایی لە کاری (بوونی بوونایەتی)دا.

**پۆلی دوەم**: پێشکاری واتاگۆڕ لە چەشنی (سەر، بەر، دەر، وەر، لا ...). ئـەم پێشکارانە، ئـەم ئاکارانە هەڵ دەگرن.

**یەکەم**: وەك نموونە، دەتوانین ئەو واتاگۆڕانە و نموونەکانیان ڕێز بکەین، نەخشەی (٤/٣).

| واتاگۆڕ | نموونە |
|---|---|
| سەر | سەرکەوتن، سەرخستن |
| بەر | بەربوون، بەردان، بەرکەوتن |
| دەر | دەربـڕین، دەربـوون، دەردان، دەرچـوون، دەرپـەڕین، دەرهـاتن، دەرهاویشتن. دەرخستن. دەرکردن، دەرکەوتن، دەرکێشان |
| وەر | وەرگەڕان، وەرگێڕان، وەرگرتن، وەرگیران، وەردان، وەرچەرخان |
| لا | لاچوون، لادان، لابردن، لاکردن |

نەخشەی (٤/٣): پێشگری واتاگۆڕ (سەر، بەر، دەر، وەر، لا)، بە نموونە[11].

**دوەم**: وەك لـە ئـەو نەخشـەیەدا دەرکـەوتوە، واتـاگۆڕی (دەر) زۆر بـە بڕشـتە، بـە بـەراورد لەگەڵ ئەوانی دیدا.

[11] بۆ ئاسانکاری لە فێرکردندا، دەشێت ئەم پۆلە پێشگرە پێکەوە گۆ بکرێن، وەك: (سەربەردەروەرلا).



منتدى إقرأ الثقافي

**سێیەم**: ئەم پێشگرانە، هەر هەموویان بە ئاشکرا واتای ئاوەڵکار دەبەخشن.

**چوارەم**: ئـەم بابەتانـە زۆر ئـاڵۆزن، بـۆ نموونـە کـاری (سـەربڕین) ڕیـز نـەکراوە، چـونکە جودایە لە نموونەکانی دی. یـان، کـاری (بەرکـەوتن) دەبێـت (وەبەرکـەوتن: کەوتنـە بـەر)، بەڵام (بەربوون و بەردان) ئەوە پەسەند ناکەن.

**پۆلی سێیەم**: پێشگری واتاگۆڕ لە چەشنی وشەی سەربەخۆ، وەك:

دان : (فڕی) دان: بەردەکە فڕێ بدە

کردن : (ڕەچاو) کردن: ئەو بابەتە ڕەچاو بکە

نان : (ڕاو) نان: ئایا کێ ڕاوت دەنێت

کەوتن : (ڕێك) کەوتن: ئێمە ڕێك ناکەوین

لە ڕاستیدا، ئەلبوومی ئەم جـۆرە کارانـە زۆر بـەرین و بەرفراوانـە و پێویسـت بـە پانۆرامایەکی تەواو دەکـات، چـونکە بابەتـە زۆر ئـاڵۆزە. ئـەم ئیشـەی ئێمـەیش بریتیـە لـە سەرەتایەك بۆ هەژاندنی بابەتەکە.

**پۆلی چوارەم**: پێشگری واتاگۆڕ بە ئامرازی پەیوەندی، وەك:

(لە دەست دان، بە فیڕۆ دان، بە دەر نان، بە خەساربردن

تا ئێستا (٢٠١٧)، ئەم جۆرە پێشگرە واتاگۆڕەمان لە خانەی (٤+)دا دا دەنـا، چـونکە ئامرازیان پێوەیە، بەڵام ئێستا بیر و بۆچوونەکان گۆڕاون، ئەوەیش لە بەر ئەوەی دەتوانن، بە سەرباری، ئامرازی پەیوەندی وەر بگرن لە خانەی ئـامرازی پەیوەندیـدا کـە بریتیـە لـە خانەی (٤+)، وەك: (ئەم کارەم پێ لەدەست مەدە، کات بە من بە فیڕۆ مـەدە، ئـەو بەشـەی لێ بەدەر نیێ، ئەو پارەیەت بە من بەخەساردا).



منتدى إقرأ الثقافي

**٤/٣: پێشگری واتاگۆڕ لە خانەی (+٥)دا:**

**ئەم جۆرە پێشگرە بریتیە لە کۆلکەی (بەرکاری ڕێزمانی)، وەك:**

دان: (بۆر)دان: ئازاد بۆڕی داوە

(ڕوو) دان: ئایا چی ڕووی داوە

(کۆڵ) دان: ئێمە کۆڵ نادەین

نان: (مل) نان: شیلان هەر مل دەنێت

(هەنگاو) نان : تۆ هەنگاو بنێ

سەندن : (تاو) سەندن: مەکینەکە تاوی سەندوە

: (جۆش) سەندن: ئاگرەکە جۆشی سەندوە

بردن : (ناو) بردن: کەس ناوی نەبردوە

گرتن : (بەرگە) گرتن: ئێمە بەرگە دەگرین

ئـەم جـۆرە بـەرکارە واتـاگۆڕە ناشـێت لابـبردرێن، چـونکە لـە فـۆرمی چـاوگدا دەردەکـەون، وەك: (بـۆردان، روودان، کۆڵـدان، ملنـان، هـەنگاونـان، تاوسـەندن، جۆشسـەندن، ناوبردن، بەرگـەگرتن، ...). لـە بـەر گرنگـی ئـەم بابەتـە، بەشـی داهـاتوو تـەرخانکراوە بـۆ ڕۆڵی کۆلکەی (بەرکار) لە واتاگۆڕیندا.

**٥/٣: پاشگری واتاگۆڕ (ەوە) لە خانەی (+٨)دا:**

سەبارەت بە پاشگری دووپاتی (ەوە)، چەند سەرنجێکی تر هەیە:

- هەر یەك پاشگری واتاگۆڕ هەیە لە زمانەکەدا ئەویش بریتیە لە ڕوخساری (ەوە).
- هەموو کاری زمانەکە، بێجگە لە (بوون و هەبوون)، ئەم پاشگرە وەر دەگرن.
- پاشگری (ەوە) بزاوتی دووبارەکردنەوە دەبەخشێت بـە هـەموو کارێك، بـەڵام مـەرج نیـە گیانی واتاگۆڕین ببەخشێت بە هەموویان.



منتدى إقرأ الثقافي

ـ هەنـدێك جـار ئـەم پاشـگرە واتـای کارێـك دەگۆڕێـت کـە جـارێکی تـر بـە پێشـگر واتـای گۆڕابێت. وەك:

**ـ بەردانەوە:**

(١): دان: واتای بنجی

(٢): بەردان: واتایەکی تر بە زەبری پێشگری (بەر).

(٣): بەردانەوە: واتایەکی جوداتر بە زەبری پێشگری (بەر) و پاشگری (ەوە).

**ـ هەڵدانەوە:**

(١): دان: واتای بنجی

(٢): هەڵ دان: واتایەکی تر بە زەبری پێشگری (هەڵ).

(٣): هەڵ دانەوە: واتایەکی جوداتر بە زەبری پێشگری (هەڵ) و پاشگری (ەوە).

**ـ هەڵگرتنەوە:**

(١): گرتن: واتای بنجی

(٢): هەڵ گرتن: واتایەکی تر بە زەبری پێشگری (هەڵ).

(٣): هەڵ گرتنەوە: واتایەکی جوداتر بە زەبری پێشگری (هەڵ) و پاشگری (ەوە).

**ـ داگرتنەوە:**

(١): گرتن: واتای بنجی

(٢): دا گرتن: واتایەکی تر بە زەبری پێشگری (دا).

(٣): دا گرتنەوە: واتایەکی جوداتر بە زەبری پاشگری پێشگری (دا) و پاشگری (ەوە).

**ـ دادانەوە:**

(١): دان: واتای بنجی

(٢): دادان: واتایەکی تر بە زەبری پێشگری (دا).

(٣): دادانەوە: واتایەکی جوداتر بە زەبری پاشگری پێشگری (دا) و پاشگری (ەوە).

لە بەر گرنگی ئەم بابەتە، هەردوو بەشی (شەشـەم و هەشـتەم) تـەرخانکراون بـۆ ڕۆڵی پاشگری (ەوە) لە واتاگۆڕیندا.



منتدى إقرأ الثقافي

**٦/٣: كارى هاو-واتا و كارى هاوڕوخسار:**

هاو-واتـايى بريتيـه لـه يەكسـانى لـه واتـادا، وەك: (ڕوانـدن، چانـدن، ناشـتن)، يـان (چوون، ڕۆيشتن)، (ناردن، ڕەوانە كـردن). ئـەم كارانـە هـەر چـەندە هـاو-واتـان بـە پێوانـە، كەچى ناتوانن بـبن بـە هـاو-واتـاى سـاغ. لـە ئـەم كێشـەيەدا زمانـەوانان وا بـۆى دەچـن كـە وشەى هاو واتا (لە سەتدا سەت) زۆر كەمە يان نيە. سـەبارەت بـە كـار لـە زمـانى كورديـدا، ئێمەيش پشتگيرى لە ئەم بۆچوونە دەكەين، چى لـە ئـەو نموونانـەدا و چـى لـە نموونـەى تردا، وەك: (خەوتن: نوستن، هێنان: هانين، چەوتانەوە: چەمانەوە، حەوانەوە: حەسانەوە، گەڕاندنـەوە: ناردنەوە،گەڕانـەوە: ڕۆيشـتنەوە). ئـەم نموونانـە، هـەر هـەموويان لـە زمـان نووسينيدا دەردەكەون و هەموو جارێك بۆ هـەمان واتـا بـەكار دەهێنـرێن. هـۆى ئەمـەيش دەگەڕێتـەوە بـۆ زارى ناوچـەيى. وەك نموونـە، خـەڵكى سـلێمانى و دەوروبـەرى (نوسـتن) بەكار دەهێنن، كەچى خەڵكى گەرميان (خەوتن) بەكار دەهێنن. زۆرجاريش بـە ئـەتيكێتى زارى سلێمانى هەندێك ڕوخسارى نـامۆ پەيـدا دەبێـت، بـەڵام لـە خۆشـبەختيدا ناگـەن بـە زمـانى نووسـين، وەك: (مـن هێنـام: مـن هـانيم)، (مـن دەم هێنـا: مـن دەم هـانى)، (مـن هێنابووم: مـن هـانى بـووم)، (مـن هێناومـە: مـن هانيومـە). لـە نموونـەكانى بەراييـدا، كـە برەويان زۆرە لە زمانى نووسيندا، ڕێـز لـە چاوگى (هێنـان) گـيراوە. بـەڵام لـە نموونـەكانى دواييدا، بە زەبرى ئەتيكێت چـاوگى (هێنـان) كـراوە (هـانين). لـە لايـەكى تـرەوە زۆر جـار (هاوبێژى Homophony) دەردەكەوێت، وەك:

| | |
|---|---|
| <u>نوانـد</u> | چاوگى (ئاندن) لە (نوستن) |
| <u>ن</u> | كارى سەربەخۆى (نواندن)، نوێنەر |

| | |
|---|---|
| <u>خـورا</u> | چاوگى بكەرنادیار لە (خواردن) |
| <u>ن</u> | كارى سەربەخۆ (خروو، ئاڵۆش) |



منتدى إقرأ الثقافي

**٧/٣: دمموونەی کاری (راکردن):**

کاری (ڕاکرن) بە واتا تێنەپەڕە، کەچی بە ڕێزمان تێپەڕە. ئەم بۆچوونە زۆر لە ڕێزماننووسان هەستیان پێکردوە، بەلاّم زەفەریان بە ڕێزمانەکەی نەبردوە. هەر لەبەر ئەوە، دۆسێیەکمان بۆ دروستکردەوە، چونکە هەستمان کردوە کە ئەم بابە ئەلبوومێکی فراوان و ئالۆزە و پێویست بە ئەوە دەکات کە بخرێتە بەر تۆژینەوەی زانستی. لە ئەم جێیەدا تەنها کاری (راکردن) دەخەینە بەرچاو، چونکە بە ڕێزمان تێپەڕە، وەك: (ئێمە ڕامان کرد)، کەچی بە واتا تێنەپەڕە و ناگوترێت: (ئێمە ڕا کردین*). لە ئێرەدا، وشەی (را) لە جێگەی (بەرکاری واتاگۆڕ)دایە و کاری (کردن)یش بوە بە کاری یاریدەر بۆی، چونکە کارەکە بەرکارەکەی سەرفکردوە لە (واتاگۆڕین)دا و فۆرمی (راکردن)یش بوە بە (تێنەپەڕ). لە زمانەکەدا، ئەم میکانیزمە زۆر باوە، بەلاّم ڕێزمانەکەی زۆر بێ خزمەتە[١٢].

**٨/٣: دمموونەی فێربوون:**

نموونەی (فێربوون) بە ڕێزمان تێنەپەڕە، کەچی لە ڕستەدا بەرگی تێپەڕی واتایی لە بەر دەکات، وەك: (ئێمە زمان فێر بووین)، نەك (ئێمە زمان فێر بوومان*). لە ئەو ڕستەیەدا وشەی (زمان) لە (بەرکار) دەچێت، هەرچەندە ئەم ڕستەیە بە شێوەیەکی تریش دەردەچەرخێت، وەك: (ئێمە فێری زمان بووین). لە راستیدا، کاری رستەکە بریتیە لە (بوونی بوونایەتی) ئەم کارەیش دەتوانێت ئاوەڵناو سەودا بکات، وەك (فێر) ئاوەڵناوەکەیش تەرخانکراوە بۆ (زمان)، وەك (فێری زمان بووین) لە سەر کێشی (رووزەردی لای تۆ بووین). یان (پەرۆشی زمانی کوردی بووین).

---

[١٢] بۆ زانیاری پتر لە سەر ئەم بابەتە، بڕوانە بۆ بەشی داهاتوو.



منتدى إقرأ الثقافي

**٩/٣: نموونەی کاری ئیرگەیتیف:**

لە نموونەیەکی تردا، وەك: (هەڵ کـردن)[١٣]، بـە هـەمان روخسـارەوە، بـە دوو جـۆر دەکەوێتەبەر ڕستەسازی، جارێك وەك تێپەڕ و جارێك وەك تێنەپەڕ، وەك:

| تێنەپەر | تێپەڕ |
|---|---|
| بایەکە هەڵ (ی) کرد | شیلان کراسەکەی هەڵ کرد |

بێگومان، ئەم نموونەیە زۆر ناوازەیە و مەگەر هەر بە سیستمی ئیرگەیتیف لێك بدرێتەوە، چونکە بە هەمان روخسارەوە دوو جۆر لە ڕستەسازی پڕ دەکاتـەوە، ڕستەسـازی تێپەڕ و ڕستەسازی تێنەپەڕ، بەڵام بۆ دوو واتای جیاواز.

**١٠/٣: هەڵەی ڕوخسار:**

زۆر جار دوو ڕوخسار دەچنەوە سەر یەك، بەڵام وایش نیە و جیاوازن لە یەکتری، وەك:

(١): (ڕوو دان)ی کارەسات، (٢): (ڕوو دان) بە کەسێك

ئەم دوو کارە هاوڕوخسارە دوو واتای جیـاواز دەبەخشـن، بـەڵام هاوڕوخساریەکان زۆر بـەهێز نیـە بـۆ کەسـێك کـە لـە ڕێزمـان بزانێـت. چـونکە وشـەی (ڕوو) لـە هـەردوو وشەکەدا لە رۆڵی (بەرکار)دایـە، بـەڵام لـە دوو دیـوی کـاری (دان)دا، کـاری سـادەی (دان) و کاری ئامرازداری (دان + بە ...). ئەمە و لە رووی شیکارەوە دەتوانین بڵێین:

(١): لە ڕستەی یەکەمدا، واتاگۆڕکێ رووی داوە، چونکە وشەی (روو) بریتیـە لـە (بـەرکاری واتاگۆڕ) و کاری (دان)یش وەك کارێکی یاریدەر ریزبوە و پێشگری (روو)ی خستوەتە بەر

---

[١٣] وەك کاری (sink) لـە زمـانی ئنگلیزیـدا، کـە بـە تێپـەڕ و تێنەپـەڕ گـەردان دەکرێـت ( V. Cook & M. Newson، p 113 ).



منتدى إقرأ الثقافي

چالاكی ڕستەسازی. بەكورتی و بە كوردی، بزاڤی (واتایی) لە سەر وشەی (ڕوو) دەگەڕێت، بەڵام بزاڤی (ڕستەسازی) لە سەر كاری (دان). بۆ بەڵگە، ناتوانین وشەی (ڕوو) لاببەین لە ئەو كارەدا، چونكە واتای تازەی داهێناوە، كەچی هەموو بەركارێكی جودا دەشێت لاببردرێت. لە لایەكی ترەوە، كۆی ڕستەكە بە لای كاری (تێنەپەڕ)دا دەڕوانێت، هەرچەندە كاری كاری (دان) تێپەڕە. ئەمەیان، چونكە كاری (دان) بەركاری (ڕوو)ی خەرجكردوە لە واتایەكی تازەدا، وەك واتای كاری (هەناسەدان، پشوودان، نووچدان، سەرسمدان، نزگەرەدان، گیاندان، ...).

(٢): لە ڕستەی دووەمدا، واتاگۆڕكێ ڕووی نە داوە، چونكە وشەی (ڕوو) بریتیە لە (بەركاری ئاسایی) و كاری (دان)یش وەك كارێكی پتەو ڕیز بوە لە بەر چالاكی ڕستەسازیدا. واتە هەردوو بزاڤی (واتایی) و (ڕستەسازی) لە سەر كاری (دان) دەگەڕێن. تەنها جیاوازی لە نێوان (پارەدان بە كەسێك) و (ڕوودان بە كەسێك) ئەوەیە كە بەركاری (ڕوو) ناوێكی واتاییە. لەلایەكی ترەوە، لە كاری (پێ گرتن)دا دوو واتا هەن. چونكە هەڵەی ڕوخسار چەسپاوە، وەك:

| (كار) | (ئامراز) | (بەركار) |
|---|---|---|
| (گرتن) | (...) | (پێ) |
| (گرتن) | (پێ) | (...) |

لە نموونەی یەكەمدا وشەی (پێ) بەكارە وەك (پێ گرتنی منداڵ)، بەڵام لە دووەمدا وشەی (پێ) بریتیە لە ڕوخساری لكاوی ئامرازی پەیوەندی (بە) وەك (بە دەست گرتن: پێ گرتن). ئەوەی سەیرە، ئەوەیە كە ئەو دوو وشەیە زۆر جیاوازن لە یەكتر، چونكە زڕخوشكن (بە ڕێزمان). بۆ مەبەستی جیاوازی، كاری یەكەم وەك خاڵی (١) وایە لەسەرەوە، چونكە وشەی (پێ: پا) بەركاری واتاگۆڕە بۆ كاری یاریدەر (گرتن). لە لایەكی ترەوە، نموونەی یەكەم دەتوانێت هەر دوو وشەكە هەڵ بگرێت پێكەوە، وەك (پێ پێ



منتدى إقرأ الثقافي

گرتن). ئەمە و لە زماندا دیاردەی هەڵەی ڕوخسار ڕەنگە کەم بێت، بەڵام تشتێکی ئاساییە، چونکە لێکچوونەکە زۆر رووکەشیە و زۆر تویژاڵیە. لە هەڵ و مەرجی ئاوادا، هەرچەند کە واتاکان جیاوازبن، بەڵام شارەزایی ڕێزمانی باشترین کەرەستەیە بۆ یەکلایی کردنەوە. یان، بە کورتی دەتوانین بڵێین: ئەو نموونانە هەرچەندە کە هاونووس ( Homograph) و هاوبێژ (Homophone) بن، بەڵام بە هیچ جۆرێك (هاوڕێزمان) نین. لە ئەم ڕووەوە، زاراوەی (هاوڕێزمانی) بۆ زمانەکەمان پێویستە، چونکە بریتیە لە جوداکەرەوەی واتاسازیانە بۆ زۆر لە کێشەکان.

**١١/٣: واتاگۆڕین بە (ئاندن):**

یەکێك لە ئەو دیاردە سەیرانەی کە کەوتنە بەرچاو لە نووسینەوەی ئەم کتێبەدا، ئەوەیە کە چەند نموونەیەك هەیە لە کاری زمانەکە کە بە ڕێژەی (ئاندن) واتایان دەگۆڕێت. ئەم دیاردەیە ئاسایی نیە، چونکە ئەرکی بگۆڕی ئاوەکی (ێن/ ان) لە کاردا بریتیە لە گۆڕینی هێزی کارەکە لە تێنەپەڕەوە بۆ تێپەڕ. بۆ نموونە، هەر دوو کاری (فڕین[١٤] و پەڕین[١٥]) ئەم ئاکارە هەڵ دەگرن، وەك:

**فڕاندن**: بە واتای: (فڕاندنی باڵدار). یان بە واتای (پڕدان لە تشتێك)

**پەڕاندن**: بە واتای: (سەرپەڕاندن)، یان بە واتای (تەرککردنی پرسیار)

ئەگەر لە ئەو ریزەدا (فڕاندن) واتای (هەڵ فڕاندنی باڵدار) بگەیەنێت، وەك (کێ کۆترەکەی فڕاند؟)، بەڵام واتاکەی دووەم لە واتای (فڕین) ترازاوە و بووە بە (پڕدان لە تشتێك)، وەك (کێ پارەکەی فڕاند؟). سەبارەت بە کاری (پەڕین) ڕوخساری (پەڕاندن)

---

[١٤] لە گەڵ کاری (فڕین: فڕاندن)دا، فۆرمی (رفین: رفاندن)یش هەیە و دەشێت کەڵك لە ئەم دوو فۆرمە وەربگیرێت لە جوداکردنەوەی واتاسازیانەدا.

[١٥] کاری (پەڕین) واتایەکی تری هەیە. وەك: (جووتبوونی نێوان نێر و مێ)ی ئاژەڵ.



منتدى إقرأ الثقافي

هەر چەند لە بنجەکەی لانادات، ئەگەر واتای (بەرد پەڕاندن بە چەکووش) ببەخشێت، بەڵام واتای دووەمی بریتییە لە تەرك کردنی پرسیارێك یان کەسێك، یان تشتێك لە ڕێزبەندێکدا، وەك: (من پرسیاری دووەمم پەڕاندوە).

**١٢/٣: واتا ئاودیوکراوەکان:**

لە ڕێزمانی کاردا، دیاردەی زۆر سەیر هەیە. یەکێك لە ئەو دیاردانە بریتییە لە (ئاودیوبوونی واتا). واتە، کارێك واتا بنجیەکەی پەڕیوە و واتاکانی دیکەی بە میکانیزمی (فرەڕوخساری) ماوەتەوە و بە چەلەنگی بەکار دەهێنرێت، وەك:

**یەکەم: پێشگری (هەڵ، دا، ڕا):**

**ئەم پێشگرانە ڕێزێك کاری بنجییان پاراستوە و لە نەمان دەربازیان کردوون.**

**(١): پاشگری (هەڵ):**

(هەڵ پاچین: (ــ) پاچین، هەڵ تووتان: (ــ) تووتان، هەڵ زنان: (ــ) زنان، هەڵ ستان: (ــ) ستان، هەڵ قوڵان: (ــ) قوڵان، هەڵ گژان: (ــ) گژان، هەڵ نووتان: (ــ) نووتان، هەڵ واسین: (ــ) واسین، ...

**(٢): پاشگری (دا):**

داپاچین: (ــ) پاچین، داپلۆخان: (ــ) پلۆخان، داخورپان: (ــ) خورپان، دامەزران: (ــ) مەزران، داساکان: (ــ) ساکان، داکۆشان: (ــ) کۆشان، دامرکان: (ــ) مرکان، داوەشان: (ــ) وەشان، ...

(٣): پاشگری (ڕا):

ڕاپسکان: (ــ) پسکان، ڕاچەنین: (ــ) چەنین، ڕاوەشان: (ــ) وەشان

بە ئاشکرا دیارە، کە نموونە بێ پێشگرەکان بێ واتان، چونکە پێشگرەکانیان فڕێداوە. لە ئەم هەڵوێستەدا، ناتوانین بڵێین: نموونە پێشگردارەکان لە هیچەوە پەیدا



منتدى إقرأ الثقافي

بووگن. چونکە سیمای فرەڕوخساریش بە جوانی پێیانەوە دیارە. بۆ نموونە، واتای کاری (وەشان) هەر ماوە بەلاَم سستە، وەك (دەست وەشان، وەشاو، وەشێنراو، وەشێنەر، مەی وەشێنە، دەی وەشێنم، ...).

(٤): پاشگرِ (ڕا) لە (ڕاگەیاندن)دا.

لە کاری (ڕاگەیاندن)دا، پاشگری (ڕا) هەیە، کەچی لە کاری (گەیشتن)دا نیە. بەم پێیە، دەبێت پاشگری (ڕا) لە ڕوخساری بنجی کاری (گەیشتن)دا واتاکەی سست بووبێت، یان پوابێتەوە، چونکە ناگوترێت (ڕاگەیشتن*)، وەك:

گەیشتن: گەیاندن: گەیەنران

(ڕا) گەیشتن*: (ڕا) گەیاندن: (ڕا) گەیەنرن

بە ئاشکرا دیارە، کە نموونەی (ڕاگەیشتن*) لە نەو گەمەیەدا دەدۆڕێت و واتای پتەو ناخاتە روو. ئەم دیاردەیەیش خۆی لەخۆیدا زۆر دەگمەنە و زۆر دانسقەیە. ئەگەرنا، لە کارەکانی دیدا گەمەی پێشگرەکان بە جوانی دەگەڕێت، چی لە چاوگی بنجیدا، چی لە چاوگی (ئاندن)دا، چی لە چاوگی بکەرنادیاردا. لە ڕاستیدا، لە کاری (ڕاگەیاندن)دا، پلەی یەکەم لە پەیژەکە ئاودیو بوە. کەواتە، دەبا (ڕاگەیشتن) چالاك با، وەك (ڕاگەیاندن).



منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی چوارەم
# واتـاگۆڕکێ بە کۆلکەی بەرکاری ڕێزمانی

**١/٤: دەستپێك و دەروازە :**

لـە زمانەکـەی ئێمـەدا بنـەمای ئاوێنـە[٦] (Mirror Principle) هـەژموونێکی گـەورە و بـەفراوانی هەیـە، چـونکە هـەردوو براقـی (ڕستەسـازی) و (وشەسـازی) ئاوێنـەی یەکترین. بە کورتی، بـە شێوەیەکی زۆر تایبـەتی کۆلکـەی بـەرکاری ڕێزمـانی لـە ڕسـتەوە دەگوێزرێتەوە بۆ ئەو وشانەی کە لە سەر (کار)ێك ڕۆدەنرێن. ئەمـە و بـۆ گەیشـتن بـە ئـەم شـیکارە وردە، لـە ئـەم بەشـەدا ڕوو دەکـەین لـە ئـەو کـارە لێکدراوانـەی کـە (بـەرکاری ڕستەسازیانە) واتایـان دەگۆڕیـت[٧]. واتـە، ئـەو بـەرکارەی کـە دەبێـت بـەهۆی دامەزرانـدنی گلێنـەی واتایـەکی نـوێ. بێگومـان، لـە ئـەم بوارەیشـدا، ئـاڵۆزی هەیـەو بابەتەکـە زۆر تێکچڕژاوە. بەهیواین بتوانین چەند هەنگاوێك لە ئەو گەمەیـە نزیـك ببینـەوە و بتـوانین خزمەتێك پێش کەش بکەین بەواتاسازی کاری لێکدراو.

**٢/٤: خانەی (بەرکار) لەپلیکانەی ڕستەدا:**

کۆلکەی (بەرکاری ڕستەسازیانە) دەکەوێتە پێش کار و بەلای ڕاستدا خانەی (+ ٥) داگیر دەکات، وەك وشەی (نامەکە) لە ئەم ڕستەیەدا:

| ڕستە | + ٥ | + ٤ | + ٣ | + ٢ | + ١ | سفر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نامەکەم بۆ ئێوە هەڵ نەدەگرت | نامەکە (م) | بۆ ئێوە | هەڵ | نە | دە | گرت |

[٦] سەرچاوەی (Katamba..Morphology, pp 276 – 277).

[٧] بۆ زانیاری پتر لە سەر ئەم بابەتە. بڕوانە بۆ بەشی (سێیەم) لە کتێبی ڕێزمانی کاری ناسادە، کاری داڕێـژراو و کاری داڕێژراو.



منتدى إقرأ الثقافي

تەنانەت، دەتوانرێت گشت خانەكانی ناوەند(+ ١، + ٢، + ٣، + ٤) لا ببردرێن، وەك:

| ڕستە | + ٥ | + ٤ | + ٣ | + ٢ | + ١ | سفر |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نامەكەم گرت | نامەكە (م) | — | — | — | — | گرت |

سەبارەت بە (ئەركی ڕێزمانی). خانەی (+ ٥)، ئەگەر هەر بارگەیەك هەڵ بگرێت، ئەوا ئەو بارگەیە لە ئاستی ڕستەسازیدا لە ئەركی (بەركار)دایە و ئەو ئەركەیش تەنها و تەنها هەر لەئاستی (كاری تێپەڕ)دا دەگونجێت. لە ئەم ڕووەوە، ئەگەر هەر كاتێك كە كارێكی (تێنەپەڕ) خانەی (+ ٥)ی پڕ كردەوە، ئەوا میكانیزمێكی ڕێزمانی لە ئارادایە و ئەو بارگەیەش كە ئەو خانەیە هەڵی گرتوە، لەئاستێكی بەرزتردایە و لە ئەو ئاستەیشدا، لە ڕۆڵی (بەركار)دایە. لە هەل و مەرجی ئاوهادا، دەشێت و دەبێت بۆ ئەو میكانیزمە ڕێزمانیە بگەڕێین كە كارێكی (تێنەپەڕ)ی گۆڕیوە بۆ كارێكی (تێپەڕ)[٧٨]. لە ئاستی واتاسازیدا، هەڵویستەكە زۆر ئاڵۆزترە، چونكە چەند جۆرێك لە جۆرەكانی (واتاگۆڕكێ) دەهێتە ئاراوە. بۆ نموونە، دەشێت كۆڵكەی (بەركار) هەر ئەركی سینتاكسی هەبێت، وەك (شیلان پارە دەدات)، یان دەشێت هەردوو ئەركی سینتاكسی و واتاسازی هەبێت پێكەوە، وەك (شیلان باوێشك دەدات).

### ٣/٤: وشە ڕۆنان بە كۆڵكەی بەركار:

لە ڕستەیەكی زۆر سادەدا، وەك (شیلان سێو دەخوات)، دەشێت كۆڵكەی (بەركار) بخەینە سەر چاوگەكەی، وەك (سێوخواردن)، یان دەشێت بچێتە هەر وشەیەكی تر كە لە ئەو ڕستەیەوە ڕۆبنرێت، وەك (سێوخۆر، سێونەخۆر، سێوخوراو، سێونەخوراو)، یان، (سێوخۆران، سێونەخۆران، سێوخوراوان، سێونەخوراوان)، یان (سێوخۆرەكە،

[٧٨] بۆ زانیاری پتر، بروانە بۆ كۆپلەی (٧/٤).



منتدى إقرأ الثقافي

ـــێونەخۆرەکە، سـێوخوراوەکە، سـێونەخوراوەکە)، یـان (سـێوخۆرێك، سـێونەخۆرێك، ـێوخوراوێك، سێونەخوراوێك). تەنانەت، دەتوانین بڵێین: (سێوخۆرە و سـێونەخۆرە). بـە ڕاستی، هـەژموون و گـەزافی (بنـەمای ئاوێنـە) بـە تـەواوی باڵادەسـت و مـەودافراوانن لـە ڕێزمـانی کوردیـدا، چـونکە هـەر کارێـك، یـان هـەر ڕسـتەیەك بـۆی هەیـە کـە بـە ژمـارەی (بـەرکارەکان) وشەی (تەرخانـکراو بە بەرکار) بڵاو بکاتەوە. بە ڕاستی، لە ڕووی بەراودەوە، ئـەم مۆرکـە زمـانی کـوردی لـەختێك جـودا دەکاتـەوە لـە زمانـانی (عـەرەبی، ئنگلیـزی، فەرەنسـی)، چـونکە ئێمـە هـەم چـاوگی سـادەمان هەیـە، وەك (خـواردن)، هـەم چـاوگی تەرخانکراومان هەیە، وەك (سێوخواردن)، بەرانبەر بە گەدانـنامـەی ڕسـتەی (شـیلان سـێو دەخـوات). هـەروەها، چـاوگی واتـاگۆڕاویش هەیـە، وەك: (خـەم خـواردن، سـوێند خـواردن، شکست خواردن، سزا خواردن، خول خواردن، سووڕ خواردن، فریو خواردن، ...).

### ٤/٤: واتاگۆڕکێ بە کۆلکەی (بەرکار):

لە هەندێك کاری لێکداوی زمانەکەدا، ئاکاری (واتاگۆڕکێ) دەردەکەوێت، نەخشەی (١/٤).

| نموونە | خانەی (+ ٥)، (بەرکار) | خانەی (سفر)، (کار) |
|---|---|---|
| هەناسە دان[١٩] | هەناسە | دان |
| هەنیسك دان | هەنیسك | دان |
| باوێشك دان | باوێشك | دان |
| بۆڕ دان | بۆڕ | دان |
| کوڵ دان | کوڵ | دان |
| کۆڵ دان | کۆڵ | دان |
| گیان دان | گیان | دان |

[١٩] بۆ زانیاری کاریگەرتر لە سەر کاری (دان)، بڕوانە بۆ هەردوو بەشی (چوارەم و پێنجەم) لە کتێبی (گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاردا)، هەولێر ٢٠١٦.



منتدى إقرأ الثقافي

| | | |
|---|---|---|
| نووج دان | نووج | دان |
| سەرسم دان | سەرسم | دان |
| تەشەنە كردن | تەشەنە | كردن |
| حەز كردن | حەز | كردن |
| سۆز كردن | سۆز | كردن |
| سكالآ كردن | سكالآ | كردن |
| شكات كردن | شكات | كردن |
| هەست كردن | هەست | كردن |
| هاوار كردن | هاوار | كردن |

نەخشەی (١/٤): بڕشتی پێشگری ناوی لە واتاگۆڕیندا.

لە ئاستی ئەو نموونەیەدا، چەند ڕاستیەك هەیە، وەك:

**یەكەم**: ئـەو كارانـە لـە دوو كـەرت پێكهـاتوون و كـەرتی یەكـەم وشـەیەكی واتـادارە و ئـەو وشەیە لەبەشە ئاخاوتنی (ناو)دایە.

**دووەم**: كەرتی دووەمـی ئـەو كارانـە لێكدراوانـە لـە بەشـە ئاخـاوتنی (كار)دایـە و ئـەو كەرتـە سیمای (یاریدەدان) و (وشە ڕۆنان)ی تێدایە.

**سێیەم**: كەرتی دووەم بوە بەكارێكی (یاریدەدەر) بۆ (ڕۆنـان)ی كـارێكی لێكـدراو. بـە نـاوێكی واتادار و سەربەخۆ.

**چوارەم**: بزاڤـی ڕستەسـازی كـەرتی دووەم (كـار) دەی گێڕێـت و كـەرتی یەكـەمیش (نـاو) لەئەركی (بەركار)دایە لە ئەو بزاڤە ڕستەسازیەدا.

**پێنجەم**: هـەردوو كەرتەكـە پێكـەوە واتایـەكیان داهێنـاوە و ئـەو واتایـە لـە سـەر تـەوەری كەرتی یەكەم دەگەڕێت. واتە، تەوەری واتاسازی كەوتوەتەسەر واتای كەرتی یەكەم.



منتدى إقرأ الثقافي

**شەشەم**: بە کۆی ئەو دوو خاڵەی پێشەوە، تەوەری (رستەسازی) لەسەر کەرتی دووەم (دان، کردن) دەگەڕێت، بەڵام تەوەری (واتاسازی) لەسەر واتای ئەو (ناو)ە دەگەڕێت کە کەرتی یەکەمی پێکهێناوە.

**حەفتەم**: ئەو کارانەی کەرتی دووەمیان پێك هێناوە (دان، کردن) (تێپەڕ)ن، بەڵام لەپاش چێکردنی (کاری لێکدراو)، هێزی تێپەڕینیان کەوتوە بە دیوی (تێنەپەڕ)دا. هەر بۆ بەڵگە، هیچ نموونەیەك لە ئەوانەی سەرەوە، هەرچەند تێپەڕبن بە ڕێزمان، بەرکاری ڕاستەوخۆ وەرناگرن، چونکە (بەرکاری ڕاستەوخۆ)ی خۆیان بەخشیوە بە (واتاگۆڕکێ) لە پێکهاتەی (کاری لێکدراو)دا.

**هەشتەم**: بەپێی ئەوەی دەگوترا، مەرجی کاری لێکدراو ئەوەیە کە (تێپەڕ) بێت بە رستەسازی و کە (تێنەپەڕ) بێت بە واتاسازی. واتە، کاری (لێکدراو بە بەرکار) بەرکاری ڕاستوخۆی تواندوەتەوە لە واتا تازەکەیدا و بۆی نیە بەرکاری ڕاستەوخۆی دووەم وەربگرێت. لە ئەم گۆشە نیگایەوە، هیچ کارێك بۆی نیە کە دوو بەرکاری ڕاستەوخۆ وەربگرێت. تەنانەت ئەوەی لە زمانی ئنگلیزیدا گوتراوە، وەك رستەی ( She gave me a letter) و هاوتاکانی، ڕەنگە پێدا چوونەوەی پێویست بێت[20]. چونکە بە شێوەیەك لە شێوەکان ئامرازی پەیوەندی قەرمبووی هەیە لە جێناوی بەرکاری ناراستەوخۆ (me) و هاتاکانیدا. واتە، جێناوی سادەی کەیسی بەرکار (me) جودایە لە جێناوی ناسادەی بەرکاری ناراستەوخۆ (me)، هەرچەندە یەك فۆرمی فۆنەتیکیان هەیە.

**نۆیەم**: کاری لێکدراو وەك بەرکاری ڕاستەوخۆ وەرناگرێت بۆی هەیە (بەرکاری ناراستەوخۆ) وەربگرێت، وەك:

**هەناسە پێ دان : هەناسەدان (بە کەسێك)**

**هەنیسك پێ دان : هەنیسك دان (بە کەسێك)**

**هەست پێ کردن : هەست کردن (بە تشتێك)**

[20] بڕوانە بۆ سەرچاوەی (Swan & Houdart, pp. 258- 259).



منتدى إقرأ الثقافي

**گلەیی لێ کردن : گلەیی کردن (لە کەسێك)**

**نکۆڵی لێ کردن : نکۆڵی کردن (لە تۆمەتێك)**

**حەز لێ کردن : حەز کردن (لە خواردنێك)**

**دەیەم**: هەندێك لەکارە لێکدراوەکان بۆیان هەیە لە کەرتی یەکەمدا، گیرفان بکەنەوە بۆ (بەرکاری راستەوخۆ)، وەك:

**ئارمزووکردن: ئارمزوو (ی میوە) کردن**

**سەیرکردن: سەیر (ی سروشت) کردن**

**یازدەیەم**: لە بانێـژەی کـاری یاریـدەدەرەوە، هـەردوو کـاری (دان) و (کـردن) لـەدوو قـاوغی کلۆر دەچن کە خانەی (بەرکار)یان والآ کردبێت بۆ واتاگۆڕکێ بە هەر ناوێکی (بەجێ).

**دوازدەیـەم**: ئـەو ناوانـەی کـە کـەرتی دوەمیـان پێکهێنـاوە، هـەر هـەموویان سـیمای (نابەرجەستەیی) دەپۆشن و دوورن لە واتای بەرجەستە.

**سیازدەیەم**: لە ئەم جۆرە کارەدا، کە بەکۆلکەی (بـەرکار) کـراون بـە (کـاری لێکـدراو)، وەك ناتوانرێت کەرتی یەکەم (بەرکار) لابردرێت، چونکە واتا کە لەناو دەچێت، هەر ئاوهـایش ناتوانرێت کۆلکەی (بەرکاری راسـتەوخۆ) بـە (جێنـاوی لکـاو) جـێگیر بکرێـت. بـۆ نموونـە، لەکارێکی ئاساییدا وەك (پارە دان) دەشێت کەرتی یەکەم (پـارە) لاببـەین، بـەلام لـەکارێکی لێکدراودا وەك (هەناسەدان) نـاتوانین وشـەی (هەناسـە) لاببـەین، یـان بیکـەین بـەجێناوی لکاو و واتاکـەیش بپـارێزین، وەك: (**پـارە دەدەیـن: دەی دەیـن**)، بـەس ناگۆڕێـت: (**هەناسـە دەدەین : دە (ی) دەین**)(*)

**چواردەیەم**: هەر کارێك کە واتای بەرکاری هەرسکردبێت، دەبێت بە ئەو (بـەرکار)ەوە ریـز بکرێت لە فەرهەنگدا، وەك: کاری (هەناسەدان)، کە جیاوازە، بە واتا، لە گشت دارِشـتەکانی کاری (دان).



منتدى إقرأ الثقافي

**٥/٤: واتاگۆڕكێ بە وشەی بیانی:**

هەر سێ كاری كـاری (دان، كـردن، بـردن) لـە قـاڵبی بـۆش و یاریـدەدەر دەچـن بـۆ هەرسكردنی **كۆلكەی (بەركار) لە واتایەكی تازەدا**، وەك (هەناسەدان، سۆزكردن، درزبردن). بـۆ نموونـە، كـاری (كـردن) دەمـی كراوەیـە بـۆ (دەرخـوارد)ی هـەر وشـەیەكی (بیـانی)، بـۆ یاریدەدان لەپێكهاتنی كاری لێكدراودا، ئەمـەیش بـە هێزتـرین بەڵگەیـە بـۆ ئـەوەی بڵـێین: **ئەم كارانە بـریتین لـە دیـوی (یاریـدەدان)دان و بـە بۆشایی خانـەی (بـەركار) كـاری نـوێ دادەهێنن، تەنانەت لە گەڵ وشەی غەیرە كوردیدا**، نەخشەی (٢/٤).

| خانەی (+ ٥) (بەركار) | خانەی (سفر) (كار) |
|---|---|
| ئیتاعەت | كردن |
| ئیتیفاق | كردن |
| ئیتیحاد | كردن |
| ئیدارە | كردن |
| ئیدیعا | كردن |
| ئیستیفادە | كردن |
| ئیستیقالە | كردن |
| ئیسراحەت | كردن |
| ئیشتراك | كردن |
| ئیعتراف | كردن |

**خشتەی (٢/٤): كاری ناسادە بە وشەی (عەرەبی).**



منتدى إقرأ الثقافي

لە ئاستی ئەم نموونانەدا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم**: لە زمانی ڕۆژانەدا، بەهۆی زمانی عەرەبییەوە، ئەم جۆرە کارە لێکدراوە لە سەر زمانی هەر هەموومان دەگەڕێت و بە هێزی ئەم جۆرە کارە لێکدراوەوە چەندین وشەی عەرەبی دەکوردێنین. لە ڕاستیدا، چیکەنەی کاری یاریدەدەر زۆر بە سووکی تەشەنە دەکات، چونکە ڕەگێشەیەکی ڕەسەنی هەیە لە بزاڤی ئاخاوتنی کوردیدا.

**دووەم**: ئەو وشانەی کەرتی یەکەم پێك دەهێنن هەر هەموویان بە بەشە ئاخاوتنی (ناو)دا تێ دەپەڕن و لەخانەی (بەرکار)دا ڕۆڵی واتاسازیانە دەگێڕن. ئەو وشانە بەس تیشکۆی واتایی خۆیان دادەمەزرێنن لە خانەی بەرکاردا و لە پاشتردا دەکەونە بەر چیکەنەی ڕستەسازی کوردی.

**سێیەم**: دەرگای کاری (کردن) کراوەیە، نەك هەر بۆ ئەو وشانە، بەڵکو بۆ ژمارەیەکی زۆر لەوشەی بیانی لەزمانانی ترەوە. بەواتایەکی تر، کاری (کردن) بریتیە لە دەمی (دەخوارد) بۆ زمانی کوردی و ئەو دەمە زۆر بە بلیمەتی دەکەوێتە کار بۆ ڕۆنانی (کاری لێکدراو) لەسەر تەوەری واتای (بەرکار).

**چوارەم**: ئەو وشانەی کە کەرتی یەکەم پێك دەهێنن لە ڕووی ڕستەسازیەوە دەکەونە بەر بازەکانی جێگۆڕکێی جێناوی لکاو (م، ت، ی، مان، تان، یان)، وەك: (**ئیتاعەت** (ت) **کرد، ئیتیفاق** (م) **کرد، ئیدارە** (ی) **کرد، ئیسراحەت** (مان) **کرد، ئیعتیراف** (تان) **کرد، ئیستیقالە** (یان) **کرد**).

**پێنجەم**: لە لایەکی ترەوە، هەردوو کاری (بوون: کردن) بریتین لە دەمی دەرخوارد بۆ مژاری (ئاوەڵناو)، وەك: (جوانبوون : جوانکردن، یان تووشبوون : تووشکردن، ...)[21].

---

[21] بۆ زانیاری پتر لە سەر ئەم بابەتە بڕوانە بۆ بەشی دووەم لە کتێبی (گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاردا/٢٠١٦).



منتدى إقرأ الثقافي

**٦/٤: ئاوەڵکار وەك بەرکاری واتاگۆڕ:**

وەك لـە پێشـتردا باسـکرا، لەخانـەی (+ ٥)دا کۆلکـەی (بـەرکار) دادەنیشـێت و هەندێك جار ئەو (بەرکار)ە هەرس دەبێت لە واتادا و دەبێت بە هۆی چێکردنی کارێکی (لێکدراو) بۆ واتایەکی تازە. لە ئەم میکانیزمەدا، چەند راستیەك هەیە، وەك:

**یەکەم**: وەك خانەی بەرکار (+ ٥) دەکەوێتە بەر مەبەست لە واتاگۆڕکێدا، بێگومان دەبێت ئەو کارە لێکدراوە بە (کاری تێپەڕ) چێ کرابێت.

**دووەم**: وەك خانەی (بەرکار) دەبێـت بـە (واتـاگۆڕ) دەبێـت ئـەو (کـارە لێکـدراو)ەی کـە چـێ دەبێت، هێزی (تێپەڕ)ی دۆڕاندبێت و بووبێت بە (تێنەپەڕ).

**سێیەم**: مـەرجی (واتاگۆڕکـێ) بریتیـە لـە ئـەو مەرجـەی کـە (کـاری لێکـدراو)ی پـێ چـێ دەبێت. هەر لەبەر ئەوە، هەر کارێك کە (لێکدراو) بێت، دەبێت کەم و زۆر لە واتـای بنجی لای دابێت، بەرەو واتایەکی تازەتر.

سـەبارەت بـە سەرباسـەکەی خۆمـان، هەنـدێك جـار خانـەی بـەرکار (+ ٥) بـە ئاوەڵکاری (دەر، لا) پڕ دەبێتەوەو کارێکی لێکدراو چێ دەبێت، وەك:

**(١): ئاوەڵکاری (دەر):**

لەئاسـتی ئـەم ئاوەڵکـارەدا، کـاری (دەربـردن) خـۆی جـودا دەکاتـەوە لـە کـارە تێپەڕەکانی تر، وەك: (دەردان، دەرکێشان، دەرهێنـان، دەرخسـتن، دەرکـردن، دەربـڕین،...)، چونکە پێشگری (دەر) لەخانـەی پێشـگری واتـاگۆڕ (+ ٣)دا دانانیشـێت. بـەڵکوو لـە خانـەی بەرکار (+ ٥)دایە و دەبێت بـە جۆرێـك لـە (بـەرکار). بـە راسـتی، بـەرکاری (دەر) لـە واتـای کاری (دەربردن)دا هەرس دەبێت و ئەو کارەیش دەبێت بە جۆرێك لە (تێنەپەڕ)، بەڵام لـە کارەکانی تـردا (دەردان، دەرکێشان، دەرهێنـان، دەرخسـتن، دەرکـردن، دەربـڕین،...)، هێـزی (تێپەڕ) پارێزراوە، چونکە پێشگری (دەر) بەرکار نیـە و خانـەی بـەرکاری بـۆ خـۆی قـۆرخ نەکردوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**٢): ئاوەڵكاری (لا):**

لە ئاستی ئاوەڵكاری (لا)دا دوو نموونەی بەرچاوی هەن، وەك (لاگرتن، لاكردن). ئەم دوو كارە خۆ جودا دەكەنەوە لەكاری (لادان) و (لابردن). بۆ نموونە، هەردوو كاری (لاگرتن، لاكردن) ئەو پێشگرە لەخانەی (+ ٥)دا دەگوزەرێنن و دەی كەن بە (بەركاری واتاگۆڕ)، بەڵام هەر دوو كاری (لادان، لابردن) پێشگری (لا) لەخانەی (+ ٣)دا دەگوزەرێنن و دەی كەن بە (پێشگری واتاگۆڕ) و بەركاریش وەردەگرن. بۆ نموونە، هەردوو كاری (لادان، لابردن) دەتوانن (بەركار) وەربگرن لەخانەی (+ ٥)دا، وەك: **(بەرد لادان، بەرد لابردن)**، بەڵام هەردوو كاری (لاگرتن) و (لاكردن) خانەی (بەركار)یان دۆڕاندوە لە واتاگۆڕكێدا و ناتوانن جارێكی تر (بەركار) وەربگرنەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیە، لە دیوی (كاری لێكدراو)دا، واتا لێكدراوەكەیان كەوتوە بە دیوی (تێنەپەڕ)دا. هەر بۆ پراوە، لە واتای لێكدراوی ئەو دوو كارەدا ئەم رامانە هەیە: (خۆ بە دوور گرتن لە ئەركێك)، وەك: **(شیلان بۆ وا لای گرتوە)**. بە هەمان شێواز، لە كاری (لاكردن)دا، واتای رووكردن لەجێیەكی لاوەكی، نەك لە مەبەست و لە نیشانە، وەك: **(تیرەكەت لای كردوە و نەی داوە لە نیشانەكە)**.

**٧/٤: واتاگۆڕكێ لەكاری تێنەپەڕدا:**

لە هەندێك كاری (تێنەپەڕ)دا، وەك (كۆست كەوتن، پەك كەوتن، ناوك كەوتن، چاوكەوتن بە...)، سیمایەكی ڕێزمانی زۆر سەیر هەیە، چونكە بە هێزی سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) وەردەچەرخێن بۆ جۆرێك لە جۆرەكانی (تێپەڕ). بۆ نموونە، لە رستەیەكی تێنەپەڕدا دەگوترێت: **(پەك دەكەوێت)**، بەڵام وشەی (پەك) بۆی هەیە وەربچەرخێت بەسەر هەر شەش كەسە ڕێزمانییەكەدا، وەك:

**من پەك (م) دەكەوێت، تۆ پەك (ت) دەكەوێت، ئەو پەك (ی) دەكەوێت**

**ئێمە پەك (مان) دەكەوێت، ئێوە پەك (تان) دەكەوێت، ئەوان پەك (یان) دەكەوێت**



منتدى إقرأ الثقافي

لـەم جـۆرە بـەکار هێنانـەدا وشـەی (پـەك) کـە لەخانـەی (+ ٦)دایـە و لـە رۆڵـی (بکەر)دایە، کەچی بار دەکات بۆ نێو خانەی بەرکار (+ ٥) و خانەکەی خۆی (+ ٦) دەدرێت بەسێتە جێناوی (من، تۆ، ئەو، ئێمە، ئێوە، ئـەوان)، کـە لـە ڕۆڵـی (بکـەر)دان. لـە پاشـتردا، سێتە جێناوی (م، ت، ی، مان، تان، یان) باز دەدەنەسـەر خانـەی بـەرکار (+ ٥) و شـەبەنگی جۆرێك لە کارێکی (تێپەڕ) دەهێننە کایەوە، وەك:

| خانەی (+ ٦) بکەر | خانەی (+ ٥) کەرتی یەکەم (بەرکار) | خانەی (سفر) کەرتی دوەم (کار) |
| --- | --- | --- |
| من | پەك (م) | دەکەوێت |

لەئاستی ئەم جۆرە بەکارهێنانەدا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم**: ڕستەکە لە ڕەسـەندا تێنەپـەڕە، بـەلاّم بـە زەبـری جێنـاوی (تێپـەڕ) خزاوەتـە نێـو پلیکانەی کارێکی تێپەڕ.

**دوەم**: لە تێپەڕی ئاساییدا، تەنها هەر لە ڕابردوودا جێناوی لکاوی (بکەر) بـاز دەداتـە سـەر خانـەی (بـەرکار)، بـەلاّم لـە ئـەم وەرچـەرخانەدا جێنـاوە لکاوەکـە لـە رانـەبردوو و لـە رابردوودا هەر باز دەداتەسەر وشەی (پەك)، کە گوێزراوەتەوە نێو خانەی (بەرکار).

**سێیەم**: ئـەم جـۆرە بەکارهێنانـە وەرچـەرخاوە، بـەهیچ جۆرێـك (فـەرمانی راسـتەوخۆ) پەسەند ناکات، چونکە ناراستەوخۆیە. بۆ نموونە، ناگوترێت.

**تۆ پەك (ت) بکەوە(*)؛ ئێوە پەك (تان) بکەون(*)**

**چوارەم**: دەرگای ئـەم جـۆرە وەرچـەرخانە کـراوەیـە، بـە ڕووی کـاری تێنـەپـەڕی زمانـەکـەدا، بەلاّم کاتێك کە کۆڵکەی (بکەر) جێناوی خـاوەنێتی وەردەگرێـت، یـان (بـەرکار) دەبێـت بـە



منتدى إقرأ الثقافي

بەشێك لە (بکەر)، وەك: **(تۆ ماڵەکە (ت) دەسووتێت)**، لەسەر کێش و ئاوازەی:**(تـۆ پـەکت دەکەوێت)**

**پێنجـەم**: بـەپێی ڕێسـای (Mirror Principle)، ئـەم جـۆرە بزافـەی ڕستەسـازی، بەراستەوخۆیی دەگوێزێتەوە بۆ بزاڤی وشەسازی[٢٢]، وەك:

| ناوی چاوگ | ناوی بکەر |
|---|---|
| **پەککەوتن، ماڵسووتان** | **پەککەوتوو، ماڵسووتاو** |

**شەشەم**: ئەو وشەیەی کە دەچێتە جێی (بەرکار)، وەك (ماڵەکـە، ماڵێـك، ماڵەکان،...) پـاك دەبێتـەوە لەئامرازەکانی ناساندن. بۆ نموونە ناگوترێت: **(ماڵەکە سـووتان*)**، وەك چـۆن لـە کاری تێپەڕی ئاساییدا، ناگوترێت **(ماڵەکە سووتاندن*)**

**هەفتەم**: ئەو ناوی بکەرەی کە جێ دەکرێت، وەك (پەك کەوتوو، ماڵ سووتاو) دەگەڕێتەوە بۆ پەسنکردنی خـاوەنی جێناوەکـانی (م، ت، ی، مـان، تـان، یـان). کـە دەگوتـرێـت (کـەوتوو، سووتاو) سیمای پەسنی راستەوخۆ دەردەکەوێت، بەڵام کـە دەگوتـرێـت (پـەك کـەوتوو، مـاڵ سووتاو)، ئەوا پەسنی ناراستەوخۆ دەدرێتە پاڵ کەسێك کە خاوەنی بەرکارەکەیە.

**هەشتەم**: ئەم بەکارهێنانە بریتیە لە ڕێچکەیەکی سنتاکسی سەربەخۆ و تایبەت، کە کـاری (تێنەپەڕ) لە جێناوی خاوەنێتیەوە دای هێناوە و خاوەنی بەرکارەکەی کردوە بـە (بکـەر). واتە. وشەی (پەك) بە جۆرێـك لـە جۆرەکـان کـراوە بـە (بـەرکار). کەواتـە، هـەرکاتێك کـە ناوێك بکەوێتە پێش چاوگی تێنەپەڕ، وەك: ( مل شکان، پـەك کـەوتن، مـاڵ سـووتان، ...)، ئـەوا ئـەو کـارە وەر دەچـەرخێت بـۆ جۆرێـك (تێپـەڕ)، وەك ئـەو چـاوگە تێپەڕانـەی کـە کۆلکەی بەرکار وەردەگرن، بە نموونەی (نامە نووسین، پارە دان، میوە خواردن).

**نۆیەم**: بە راستی هێزی تێپەڕینی کار لە (تێپەڕ) و (تێنەپەڕ) بریتیە لە ژێرخانێکی پتەو بـۆ (واتاسازی)، چونکە کۆلکەی (بەرکار) ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە بەرپاکردنی واتای تازەدا.

[٢٢] وەك لە پێشتردا ئامازەی بۆ کرا، هەمان سەرچاوەی(Katamba.):.(277 pp 276



منتدى إقرأ الثقافي

**٨/٤: جیاوازی نێوان دوو بەرکار:**

لەڕوانگەی کاری لێکدراوەوە، ئەگەر سەیری ئەم دوو نموونەیەی خوارەوە بکەین، دەبینین کە چەند خاڵێکی جیاوازی هەیە لەنێوان کۆڵکەی (بەرکار) لەکارێکی ئاساییدا، وەك (پارە) و کۆڵکەی بەرکار لە کاری لێکدراودا، وەك (وچان)، بەنموونەی (**ئێمە پارە دەدەین: ئێمە وچان دەدەین**).

**یەکەم**: وشەی (پارە) لە نموونەی یەکەمدا بریتیە لە (بەرکار)ی ڕستەسازیانە، بەڵام وشەی (وچان)، بە ئەرکی (بەرکار)ەوە واتایەکی نوێی داهێناوە.

**دووەم**: هەرچەندە هەردوو وشەی (پارە) و (وچان) لە بەشە ئاخاوتنی (ناو)ن، بەڵام یەکەمیان (پارە) بەرجەستەیە و ڕووی سەختی هەیە، بەڵام وشەی (وچان) ڕووی واتایی و نابەرجەستەیی دەنوێنێت. تەنانەت، بە شێوەیەکی گشتی کەرتی یەکەمی کاری لێکدراو لە ئەم چەشنەیە.

**سێیەم**: دەشێت وشەی (پارە) لە ڕستەی یەکەم دەربئاژنرێت بەبێ ئەوەی واتای کاری (دان) بگۆڕێت بەڵام لەنموونەی دووەمدا، ناکرێت و نابێت وشەی (وچان) دەربئاژنرێت. چونکە ئەو واتایە دەپووچێتەوە کە واتای بەرکاری (وچان) دای هێناوە.

**چوارەم**: دەشێت بەرکاری (پارە) لە ڕستەکەدا بکرێت بە (جێناوی لکاو)، بەڵام لە ئاستی بەرکاری (وچان)دا ئەو کردەوەیە مەحاڵە، مەگەر بەزۆرە ملی.

**پێنجەم**: بەرکاری (وچان) و هاوتاکانی. زۆر بە ڕووتی دەچنە نێو خانەی (بەرکار)ەوە و لە ڕێساکانی (کۆمەڵەی ناو) لادەدەن، بەڵام بەرکاری (پارە) ملکەچە بۆ ئەو ڕێسایانەو دەشێت بگوترێت: (**من پارەکە دەدەم، من پارەکەت دەدەم، من پارەی ئێوە دەدەم، من ئەم پارەیە دەدەم**). لە بەرانبەردا، ئاکاری (لاملی) و (یاسا بەزێنی) بە ئاشکرا دیارە بە بەرکاری (وچان)ەوە، چونکە کەرتی یەکەمی کاری لێکدراوی پێك هێناوە و ناهێڵێت بە شێوەی بەرکاری (پارە) بڕازێتەوە بە مۆرفیمی تر.



منتدى إقرأ الثقافي

**شەشەم**: دەشێت بەرکاری (پارە) بکرێت بە (جێگری بکەر) لەرستەی (بکەر نادیار)دا، وەك (پارە درا)، کەچی ئەم کردەوەیە زۆر سست و بێ بڕشتە لەئاستی وشەی (وچان)دا، چونکە بوە بە کەرتی یەکەم لە کارێکی لێکدراودا لە چەشنی (وچان دان).

**هەفتەم**: ئەو کارەی کە بەکۆڵکەی بەرکار (وچان) دەبێت بە کاری لێکدراو لە ڕووی واتاسازییەوە دەچێتەسەر ڕەفتاری کاری (تێنەپەڕ)، چونکە (بەرکار) وەرناگرێت. بەڵام لەنموونەی (پارەدان)دا، سیمای کارێکی تێپەڕ ناشکرایە.

**٩/٤: کاری دەنگە سروشتیەکان:**

لە خولگەی (بەرکار)دا، چاوگی (ئاندن) دەنگێکی سروشتی هەرس دەکات و خێزانێك لە کاری دی دەخاتە ڕوو، کە پێیان دەگوترێت (کاری دەنگە سروستیەکان)[٢٢]. ئەم جۆرە کارە، بنجەکەیان بریتیە لە دەنگە سروشتیەکە. ئەو دەنگەی کە خۆی لە خۆیدا بریتیە لە (بەرکار)، وەك:

چریکە: چریکاندن، گرمە: گرماندن، زیکە: زیکاندن، جیڕە: جیڕاندن، ناڵە: ناڵاندن، فیشکە: فیشکاندن، نووزە: نووزاندن، چرپە: چرپاندن، نەڕە: نەڕاندن،...

وەك لە پێشتردا باسکرا، ئەو نموونانەی سەرەتا بریتین لە (دەنگی سروشتی). پاشان ئەو دەنگانە لە دروستبووندا دەبن بە (بەرکار) و (بکەر)یش ئەو سەرچاوەیە کە بە بەرهەمیان دەهێنێت. بێگومان جۆرە کاری ئاوها بەرکاری ناوێت، چونکە بنجەکەی برییتە لە (بەرکار) و ڕوخسارەکەی و واتاکەی لە سەر واتای (بەرکار) ڕۆنراون.

**١٠/٤: واتاگۆڕکێ بە کۆلکەی بەرکاری ڕێزمانی:**

ئەگەر بە سەرنجێکی ورد لە کاری (خواردن) وردببینەوە، دەبینین کە بزاڤی واتادانەوە زۆر جوانی هاڕیوە و هەرسی کردوە لە چەندین واتادا، وەك:

[٢٢] بۆ زانیاری پتر لەسەر ئەو بابەتە بڕوانە بۆ بەشی هەشتەم لە کتێبی (گەشتێك بە نێو ڕێزمانی کاردا/٢٠١٦).



منتدى إقرأ الثقافي

(١): نـــان خـواردن، (٢): بـەرتيل خـواردن، (٣): سـوێند خـواردن، (٤): سـزا خـواردن، (٥): پێوانە خواردن (پێوەچوون).

لە ئەم واتايانەدا، واتابەستى (بەركار) واتاكەى جێگير كردوە و زۆر بەكارهێنانى سەربارى پەيداكردوە، وەك:

(١): ئازاد(نان) ناخوات، (٢) ئازاد (بەرتيل) ناخوات، (٣): ئازاد (سوێند) ناخوات، (٤): ئازاد (سزا) ناخوات، (٥): دەرگاكە (مێزەكە) ناخوات.

لە ئەم نموونانەدا، بە جۆرێك لە جۆرەكان، كۆلكەى (بەركارى ڕێزمانى) هەرس بوە لە واتاى كارى (خواردن)دا، بەڵام بە ئەم شێوازانەى خوارەوە:

**يەكەم:** لە ڕستەى يەكەمدا (نان خواردن) كارى (خواردن) لە واتاى بنجيدايە و ڕووداوى پتەوى (خواردن) لە ئارادايە، بەڵام بەركارى (نان) واتاى كارەكەى بەستوە بە چاوگى (نان خواردنەوە). ئەوەى سەيرە لە ئەم چاوگەدا ئەوەيە كە واتاى ناوى (نان) فراوان بوەتەوە و پەلى هاويشتوە بە سەر گشت جۆرەكانى خواردەمەنيدا. ئەگەرنا، كارى (خواردن)، لە (نان خواردن)دا، لە واتاى بنجيدايە، بەڵام بەركارى (نان) لە واتاى بنجيدا نيە و واتاگەى كارەكەى تەرخانكردوە، چونكە ڕێزمانى كوردى ڕێيداوە كە مژارى (چاوگ) تەرخان بكرێت بە كۆلكەى (بەركار).

**دوەم:** لە ڕستەى دوەمدا، كارى (خواردن) واتاى بنجى خۆى نەدۆڕاندوە، بەڵام بە ميكانيزمى (فرەواتايى) بوە بە (بەرتيل خواردن). لە ئەم هەڵوێستەدا، هەندێك لە پارچەكانى بەركارەكە كرتێنراوە، وەك: (پارە)ى بەرتيل خواردن، يان (نان)ى بەرتيل خواردن. كەواتە، كارى (بەرتيل خواردن) ڕووداوەكەى نەدۆڕاندوە و لە واتاى كارى (خواردن)ەوە پەيدا كراوە، بەڵام جۆرى بەرتيلەكە (بەركارەكە) گۆڕاوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**سێیەم:** لە نموونەی سێیەم و چوارەمدا، ڕووداوی پتەوی (خـواردن) بـە دەم و هەرسـكردن بە كۆئەندامی هەرس لە ئارادا نین. هەر لە بەر ئەوە. بەركارەكە ئاسایی نیـە و خـۆی زاڵ كـردوە بـە سـەر ڕسـتە كورتەكـەدا و واتـای كـاری (خـواردن)ی گۆڕیـوە. بـە كـورتی، كـاری خواردن لە ڕۆڵی یاریدەدەردایە و واتای هەردوو بەركاری (سوێند و سزا)ی هەرسكردوە لـە دووكاری نوێـدا (سـوێندخواردن و سـزاخواردن). لـە كـاری (سـوێند خـواردن)دا، سـوێندەكە شـوبهێنراوە بەتێكەیـەك. كـە چـوە نێـو گـەدە ئـی دی ناگەڕێتـەوە و ئەگـەر گەڕایـەوە بـە ڕژانـەوە، ئـەوا هەڵوێسـتێكی ناشـیرین پەیـدا دەبێـت. واتـە. (سـوێند) وەك (خـواردن) وایـە دەبێت لە پێشدا بڕیاری لەسەر بدرێت، چونكە خواردنێـك كـە خـورا، ئیـدی گەڕاندنـەوەی نیە. بە هەمان شێوە، لە كاری (سزا خـواردن)دا، وەك (دارخـواردن، كوتـەك خـواردن، شـاپ خـواردن، مشـتە كۆڵـە خـواردن، ...)، واتـای كارەكـە شـوبهێنراوە بـە خـواردنی چشـتێكی ناخۆش، كە بە زۆر دەرخوارد بدرێت وەك (سزا). زۆر جاریش هەر بـە واتـای خـوازراو بـۆ (سزادان) دەگوترێت: (ئازاد دوو كەبابی خوارد)، بە واتای( دووری داری خوارد)، یان (دوو داری لێ درا).

**چوارەم:** لە نموونەی پێنجەمدا، پێوانە و قەباری (دەم) و (تیكە) وەرگیراوە. بۆ نموونە، لە ڕسـتەی (دەرگاكـە مێزەكـە نـاخوات)دا، وشـەی (دەرگاكـە) شـوبهێنراوە بـە (دەم) و وشـەی (مێزەكە) شوبهێنراوە بە (تیكە). هەر لە بـەر ئـەوە، واتایـەكی تـازە پەیـدا كـراوە لـە سـەر ڕاستیەك، كە بریتیە لە: (دەبێت پێوانەی تێكە و پاروو لـە پێوانـەی دەم بچووكتر بێـت). یـان، ئەگـەر بـە پێوانـەی ئەنـدازیاری دوو چشـت بـە یەكـدا ڕەت بـوون، ئـەوا مـەرجی (خواردن) پەیدا دەبێت. ئەو مەرجەیش. ئەوەیە كە (بەركار) لە (بكەر) بچووكتر بێـت بـە پانی، بە بەرزی، بە تیرە، یان بە قەبارە.



منتدى إقرأ الثقافي

**٤/١١: گۆڕینی بەرکار:**

لەلایەکی ترەوە، لە کارێکدا وەك کاری (سووتان)، چەند سیمایەکی واتایی هەیە و ئـەو سیمایانە چـەند توخمێـك لـە ڕووداوی کارەکـەدا کـۆ دەکەنـەوە، وەك: (سـووتەمەنی، ئۆکسجین، دووکەڵ و هیس، دەنگ، ڕووناکی، ...). لە ئەم جغزەدا، ئۆکسجین و سووتەمەنی دەچنە ژوورەوە و لە ئەنجامدا چەند جۆرێك لـە وزە (دەنـگ، ڕووناکی، گـەرمی) و چـەند پاشـەڕۆکێك دەردەچـن، وەك (دووکـەڵ، سـووتوو، هـیس). هـەموو پێکهاتـەکانیش وشـەی (ئاگر) پێك دەهێنن. بەڵام ئەگەر وشەی (ئاگر) بکەین بە (بکەر)، ئـەوا دەڵـێین: (ئاگرەکە دەسووتێت)، وەك: (دارەکە دەسووتێت). ئەم دوو واتایە لە یەکتری جودا دەبنـەوە، چونکە یەکـەمیان واتــای بــەردەوامبوونی ڕووداوی (ســووتان) دەردەخــات، بــەڵام دووەمیــان، بــە ڕاستەوخۆیی ڕووداوی کـاری (سـووتان) دەردەخـات. بـە واتایـەکی دی، لـە ڕسـتەی دووەمـدا (دارەکە) دەبێت (خۆڵەمێش)، بەڵام لـە واتـای یەکەمـدا، هـەواڵی بـەردەوامبوونی ئاگرەکـە گرنگە. هەر لەبەر ئەوە، دەتوانین ئـەو واتایـە بـە هوردی و بـە زرنگـی لـە ئـەم ڕسـتەیەدا جودا بکەینەوە: (شیلان چراکە مەسووتێنە)، بە واتای گلێنەیی و بنچینەیی بـە (شـیلان) دەڵـێین: (ئـاگر لـە چـراکە بەرمـەدە و هـەموو چـراکە مەکە پاشـەڕۆکی سووتاو). لـە واتـا تازەکـەدا، کـە ئـەم میکانیزمـە پەیـدای کـردوە، دەڵـێین: (چـراکە دامەگیرسـێنە و نـەوتی چراکە خەرج مەکە). یان، لـە ڕسـتەیەکدا، وەك: (شـیلان دارەکـە مەسـووتێنە، یـان شـیلان دارەکە مەشکێنە)، هەر واتای گلێنەیی و بنچینەیی هەیە و واتای لاوەکی خۆی ناسەپێنێت بەسـەردا. پاشـان، کـە دەگوترێـت: (شـیلان ئاگرەکـە مەسـووتێنە)، وشـەی (ئـاگر) خـۆی سووتانە و نیدی چی بسووتێنێت. هـەر لەبـەر ئـەوە، واتـای گلێنـەیی لادەچێت و تـەنها و تەنها هـەر واتـای (سـەربار) خـۆی دەسـەپێنێت لـە بـیردا. ئەگـەرنا، واتـا دانانـەوەی وشـەی (چرا)، جیاوازە لە واتادانەوەی وشەی (دار) لە ئەو ڕستانەدا. کەواتە، لاواتایەك پەیـدا بـوە لە ئاستی (چرا)دا. بە واتایەکی دی، وشەی (چرا) بـوە بـە (واتـا بەسـت) بـۆ تـەرخانکردنی واتای کاری (سووتاندن) بۆ واتایەکی تەسك و تایبەتی. لە ڕاستیدا، ئەم واتایە برشتی زۆرە لە ئامێردا، وەك (چرا، لۆکس، پەرەمێز، مەکینە، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن، ...). لـە هـەموو ئـەو بەکارهێنانەدا، واتای (بەردەوامی لە بزافی سووتاندا) برەوی هەیە.



منتدى إقرأ الثقافي

**١٢/٤: واتادانەوە بە شێوازی بەرکار:**

لە ئەم جۆرە واتایەدا، بە هیچ جۆرێك ڕووداوی کارەکە لانابردرێت، بـەڵام واتـای گشتی کارەکە تەسك دەکرێتەوە بۆ واتایەکی تایبەتی، کە لە سەر (شێواز) چەق ببەستێت. واتە، کارەکە ڕوودانی هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی تایبەتی، وەك:

| | |
|---|---|
| جل بڕین | شیلان کراسەکەی بڕی |
| پرچ بڕین | شیلان بە جوانی پرچی منداڵەکەی بڕی |
| خشت بڕین | وەستا جوامێر خشت دەبڕێت |

لە ئەم واتایانەدا، واتای کاری (بـڕین) تەسـککراوەتەوە بەسـەر کۆلکـەی (بـەرکاری ڕێزمانی)دا کە بریتیـە لـە (جـل. پـرچ. خشـت). لـە ئـەو نموونانـەدا، کۆلکەکانی (بـەرکار) شـێوازی بـڕین دەسـەپێنن بـە سـەر واتـای کـاری (بـڕین)دا، چونکە گشت کاتێـك لـە سـەر شـێوازی نەخشـە و پێوانـە دەبـڕدرێن. ئەمـە و کاتێـك کـە میکانیزمی (شـێوازگری) واتـای کاری (بڕین) دەگوێزێتەوە، چەند سیمایەك دەهێتە کایەوە، وەك:

**یەکەم**: هەموو سیماکان دەمێنن، بەڵام سیمای (سروشتی ڕووداوەکە) دەگۆڕێت.

**دووەم**: سروشتی ڕووداوەکە هەر چەند ڕووداوی بـڕین نادۆڕێنێت، بـەڵام واتـای بەرکارەکـە (شێوازی بڕین) دادەهێنێت.

**سێیەم**: لـە شـێوازی بڕینـدا، هەنـدێك ئاکـاری نـوێ پەیـدا دەبـن، وەك: (بـڕین بـەگوێرەی نیگـاری ئەنـدازیاری، بـڕین بـەپێی پێوانـەی درێـژی، بـڕین بـەپێی لێـك چەسـپاندنی پارچەکان).

**چوارەم**: ئەو سیمایانەی خاڵی سێیەم، لە (بەرکار)ەکەدا هەن. بـۆ نموونـە، وشـەی (کـراس) لە (کراس بڕین)دا، یان وشەی (خشت) لـە (خشـت بـڕین) ئاکـاری ئەنـدازیاری و پێوانـەیی هەڵ دەگرن.



منتدى إقرأ الثقافي

**پێنجەم**: بەپێی خاڵی پێشوو، وشەی (كـراس) و وشـەی (خشـت) بـوون (واتـاگۆڕ) بـۆ كـاری (بـڕین). بـە هـەمان، شـێوە، وشـەی (پـرچ)، ئـەو سـیمایەی وەرگرتـوە و كـاری (بـڕین)ی پاڵبەست كردوە بەخۆیەوە.

**شەشەم**: ئەگەر وشـەكانی (كـراس، خشـت، پـرچ) ئاكـاری ئەندازیارییانـەیان هـەڵ نـەگرتبا، بێگومان واتای (بڕین لە سەر نەخشە) لە بیری ئێمەوا پەیدا نەدەبوو.

**١٣/٤: لابردنی بەركار:**

زۆر جار فرەواتایی بە فرێدانی (بـەركار) پەیـدا دەبێـت و هەنـدێك جاریش ئـەو واتـا تازەیـە زاڵ دەبێـت بـە سـەر واتـا بنجیەكـەدا، كـە بریتیـە لـە گلێنـەی واتـایی لـە ئـەم میكانیزمـەدا. لـە ڕوومـاڵێكی بەرچـاویدا، دەردەكـەوێت هـەموو ئـەو بەركارانـەی كـە لا دەبرێن، بریتین لە ئەو وشانەی، كە ڕووی مەجلیسـیان نیـە و دیمانـەیان زۆر ناشـیرینە لـە ئاخاوتندا. بۆ نموونە، دەبینین كە ئەم كارانـەی خـوارەوە تەسـك بوونەتـەوە بـۆ واتایـەكی نوێ، ئەگەر بە تەنهایی گۆبكرێن:

(خواردنـەوە): خواردنەوەی شلی سەرخۆش كەر وەك: مەی، شەراب، بیرە....

(كردن): ئەنجامدان كاری زایەندی.

(خواردن): بەرتیل وەرگرتن.

(شۆردن): بۆ نەریتی مانگانەی ئافرەت.

(لێ دان): دەستكەوتنی گەورە بەبێ ڕەنج.

لە ڕوانگەی ئـەم جـۆرە واتایـەوە، كـە دەگوترێـت: (ئـازاد ـــ دەخواتـەوە)، هـیچ واتایەكی دی ناهێت بە بیردا، بێجگە لە ئەو جۆرە (خواردنەوە)یەی كە سەرخۆشكەرە. لە ئەم هەڵوێستەدا، ئەگەر بمانەوێت واتای گشتی (خواردنەوە) لە واتای تەسك و تازەی (مەی و مادە سەرخۆشكەرەكان) بترازێنین، دەبێت (بەركار)ەكە دابنێین، وەك:

ئازاد (ئاو) دەخواتەوە، ئازاد (چا) دەخواتەوە،

ئازاد (ئاوی میوە) دەخواتەوە، ...



منتدى إقرأ الثقافي

لە نموونەیەکی دیدا، وەك: (ئازاد باش -- خواردی)، واتای (بەرتیل خواردن) زاڵ دەبێت و ئەو واتاتەسك و سووکە بە ئەوە لادەچێت، کە بەرکارەکە ڕیز بکەین، وەك: (ئازاد باش نانی خوارد)، یان ئەگەر گوترا: (ئازاد چاك لێی داوە). ئەمە و واتای کاری (لێ دان) تەسك بوەتەوە بۆ بەختی یاوەر و دەستکەوتی گەورە بەبێ ئەوەی خۆی هیلاك کردبێت. لە ڕاستیدا، ئەم جۆرە واتایانە زۆر بەرتەسك و تایبەتین، زۆر جاریش واتای سووکی دەدەنەوە. هەر لەبەر ئەوە، لە ئاخاوتنی کوردەواریدا، بە سەلاری گفتوگۆ و ڕێزگرتن لە گوێگران بەرکارەکەیان دەکرێت بە ناگفتە.

**١٤/٤: دوو نموونەی ناوازە لە واتاگۆڕکێ:**

لە بەراوردی دوو نموونەی کاری (خواردن)دا، وەك: (مافخواردن) و (شکستخواردن)، دەردەکەوێت کە لە هەردوو نموونەکەدا هەردوو کۆلکەی (بەرکاری ڕێزمانی)، واتە (ماف و شکست)، هەرسکراون. بەلاَم بە دوو ڕێگای جیاواز. لە ئاستی کاری (ماف خوران)دا، بە واتای (غوبن) لە عەرەبیدا، ئالۆزیەکی زۆر هەیە، وەك:

**یەکەم**: لە ئاستی کاری (خواردن)دا، واتایەکی لاوەکی خوازراوە، لە سەر ئەندازەی (نانخواردن)، چونکە دەشێت ئەو مافە خوراوە شوبهێنرابێت بە بەشە خواردنی کەسێك.

**دوەم**: کاری (مافخواردن) چوەتەسەر ڕێچکەی (بکەرنادیار) و بوە بە (مافخوران). بێگومان، کاری لێکدراوی (ماف خوران) هێزی کاری (تێنەپەڕ)ی هەیە، چونکە لە پەرێزی (بکەرنادیار)دایە.

**سێیەم**: وشەی (ماف) وەك بوە بە (جێگری بکەر) لەخانەی (+ ٥)دا دانیشتوە و جێناوی خاوەنێتی وەرگرتوە، وەك:

**من ماف(م) خوراوە، تۆ ماف(ت) خوراو، ئەو ماف(ی) خوراوە**

**ئێمە ماف(مان) خوراوە، ئێوە ماف(تان) خوراوە، ئەوان ماف(یان) خوراوە**



منتدى إقرأ الثقافي

بـە پێچـەوانەوە، لـە كـارى (شكسـتخواردن) بـە راسـتەوخۆيى بـەركارى (شكسـت) هەرسكراوە لە واتاى كارى (خواردن)دا، وەك (سزا خواردن: يان سـزا چێشتن). بـە كـورتى، كارى (مافخواردن) چوەتەسەر دەروازەى (بكەرناديار) و بـوە بـە (مـافخوران)، بـەلأم كـارى (شكسـتخواردن) بـە راسـتەوخۆيى لـە دەروازەى كـارى (خـواردن)ەوە واتـاى بـەركارى (شكست)ى هەرسكردوە. هـەر لـە بـەر ئـەوە، ئـەو دوو نموونەيـە بـە دوو رێچكەى جياواز واتـاى بـەركاريان هەرسـكردوە، چـونكە يەكـەميان (مـافخوران) لـە دەروازەى تێنەپـەڕى (بكـەرناديار)ەوە چـوەتە ژوورەوە، بـەلأم دوەميـان (شكسـخواردن) لـە دەروازەى تێپـەڕى (خـواردن)ەوە چـوەتە ژوورەوە. كەواتــە، بزافــى (رێزمـان) دەتوانێـت ياريـدەى بزافــى (واتاسازى) بدات بە رايەڵەيەكى زۆر باريك و ناسك، كە دەشێت چاوى توێژەران بە ئاسانى فەرقى بكات لە نێو هەزارلۆغانەى واتاسازيدا.



منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی پێنجەم
## واتــای ئیدیۆم و واتــای خوازراو

**١/٥: سەرەتایەك:**

دكتۆر ئەحمەد موختار عومەر دەڵێـت: دیـاردەی فرەواتـایی ( Polysemy) زۆر هێواش و لە سەر خـۆ دەچەسـپێت، بـەڵام دیـاردەی واتاخواسـتن زۆر خێرایـە و بـەخێرایی بـەرپا دەبێـت. تـا ڕادەیـەكی زۆر، ئێمـە لەگـەڵ ئـەم بۆچـوونانەداین و ئێمـەیش وا هەسـت دەكـەین كـە فرەواتـایی تەریبـە بـە پێشـكەوتن و بـاری كۆمەڵایـەتی مـرۆڤ. بـەڵام واتـای خــوازراو لــە چركەســاتی پێویســتدا لــە زاری بلیمــەتانی زمانپــاراو و ڕەوانبێژانــەوە گــۆ دەكرێت. بە واتایەكی دی، واتای خـوازراو ڕۆژانـە لـە سـەردەمی هـەموان لـە دایـك دەبێـت، بەڵام تەنها نموونەی كەڵكدار كاریگەریەتی دەنوێنێت لە مانەوەدا. (نەخشەی ١/٥).




نـەخشەی (١/٥): بـزاڤی واتادانەوەی كار.

واتە، هەر واتایەكی بنجی بۆی هەیە، كە لە سەر باری ستوونی بە هێواشی و بە هێـوری چالاكی (فرەواتایی) بنوێنێت، یان لە سـەر بـاری ئاسـۆیی بـە زیتـەڵی بـە خێرایـی چـالاكی (واتاخوازی) بنوێنێت. نموونەیەك بۆ ئەمە بریتیە لە كاری (سووتان)، نـەخشەی (٢/٥).




نـەخشەی (٢/٥): كارتـی واتادانەوەی كاری (سووتان).



منتدى إقرأ الثقافي

ـە جۆرە کارتی ئاوهادا چەند خاڵێك هەیە:

**یەکەم:** ئەو کارتەی کاری (سووتان) لە سەر باری ستوونی کراوەیە بۆ فرەواتایی و ئەو چالاکیە ڕاوەستانی بۆ نیە، بەڵام بە هەنگاوی زۆر ورد و هێواش و ژیرانە، وەك نموونەی (گلۆپەکە سووتا)، بە واتای (گلۆپەکە لە کارکەوت، چونکە دەزوولەکەی سووتا)، واتە لە نێرەدا دەشێت بگوترێت: (دەزوولەی گلۆپەکە سووتا)، بەڵام وشەی (دەزوولە) کرتاوە و وزەکەی پاشەکەوتکراوە.

**دووەم:** لە سەر باری ناسۆیی. پرۆسەی واتاخوازی هەیە و هەر واتایەکی ستوونی، لە فرەواتاییدا، بۆی هەیە ڕوو بکات لە واتای خوازراو، وەك نموونەی (سەڵاوەکەم سووتا)، بە واتای (سەڵاوەکەم وەڵام نەدرایەوە). ئەم جۆرە واتایە لە ژێر ڕکێفی زاراوەی (خوازە)دایە، چونکە، لە لایەکەوە واتا بنجیەکەی (پووچەڵ)ە و لە لایەکی ترەوە، دیاردەی (شوبهاندن و وێکچوون) زاڵە بە سەر ڕستەکەدا.

**سێیەم:** بە پێی چەمکی خاڵی پێشوو، دەبێت هەموو پێکهاتە و سیما دوور و نزیکەکانی (واتای بنجی) بخرێتە نێو چیکەنەی شیکاری زانستی، چونکە لە نێوان واتایەکی (بنجی) و (نابنجی)دا سەرەداوێك هەیە، یان ڕایەڵەی تۆڕێکی زۆر باریك و ناسك هەیە. بێگومان، چاوی توێژەر دەبێت ریشاڵەکانی ئەو تەیمانە شووشەییە فەرق بکات.

**چوارەم:** پێکهاتە دوورەکانی (واتای بنجی) بریتین لە:

(١): ئەنجامی ڕووداوی ڕاستەقینە: وەك (بوون بە سووتوو و بە خۆڵەکەوە) لە ڕووداوی کاری (سووتان)دا. ئەم جۆرە سیمایە دەشێت واتای (خوازە)ی لێ بکەوێتەوە، وەك واتای ڕستەی (سەڵاوەکەم سووتا) لە نەخشەی پێشوودا. بێگومان، هەر یەك واتا هەیە و بیستەرانی (زمانی دایك) بە جوانی لێی تێ دەگەن، بەڵام بیستەرانی (زمانی دووەم) بە خوار و خێچی ئەو واتا نەکلۆکە هەرس دەکەن. چونکە (سەڵاو) مادەیەکی نەسووتە.

(٢): پەیامی ڕووداوی ڕاستەقینە: وەك (بوونی مادەیەکی بە کەڵك بە مادەیەکی بێ کەڵك) لە ڕووداوی کاری (سووتان)دا. ئەم جۆرە سیمایە دەشێت واتای (ئیدیۆم)ی لێ بکەوێتەوە، وەك واتای ڕستەی (٢) لە نەخشەی پێشوودا: (پارەکەم سووتا)، چونکە دوو



منتدى إقرأ الثقافي

واتـا دەداتـەوە، یەکـەمیان واتایـەکی راسـتەقینە، چـونکە پـارەی کاغـەز دەشـێت بسووتێت، دووەمیان واتایەکی ناراستەقینە، چونکە دەشێت پارەکە لە بازرگانیدا تێداچووبێت، یـان لـە قومـاردا دۆڕێنرابێـت. بێگومـان، بیسـتەرانی (زمـانی دایـك) لـە واتـای دووەم (ئیـدیۆم) زاڵ دەکەن، بەڵام بیستەرانی (زمانی دووەم) واتای یەکەم (واتای بنجی) زاڵ دەکەن.

**پێنجەم:** ئەو واتایانەی، کە لەسەر باری ستوونی لە دایك دەبن لە (فرەواتایی)دا، لە ماوەی زۆر دوور و جیاوازدا دەردەکەون. هەر لەبـەر ئـەوە، زۆر زۆر زەحمەتـە بـۆ زمانزانێـك کـە بتوانێت هەموو واتاکان لە خشتەیەکدا ڕیز بکات.

**شەشەم:** ئەو واتایانە، کە لە سەرباری ستوونی لە فرەواتاییدا پەیدا دەبن مەرج نیە زۆربڕ بکەن، لەوانەیە هەر واتایەك، وەك کاتی پەیـدابوونی هەیـە، کـاتی کۆچکردنیشی هـەبێت. هـەر لەبـەر ئـەوە، بزاڤـی فرەواتـایی بریتیـە لـە داینـامیزمێکی هەمیشـەیی زۆر دژوار و پێچاوپێچ، کە ناتوانرێت بە ئاسانی تەی بکرێت.

**هەفتەم:** لەبەر ڕووناکی حاڵی پێشوو، لەوانەیە واتایەك هەبێت، کە لە زامـاڵی فرەواتاییـدا لە دایك بووبێت. بەڵام نەگەیشتبێت بە سنووری واتای خوازراو. یان، واتایەك هـەبێت، کـە لە ئەلبوومی واتای خوازراودا هـەبێت بـەڵام لـە ئـەلبوومی فرەواتاییـدا واتاکـەی مردبێـت. هەر لەبەر ئـەوە، زۆر زۆر کـارێکی دژوارە، کـە بتـوانین چـارۆکەیەك بکەینـەوە بـۆ ئامـاری هەموو واتاکانی کارێك.

**هەشــتەم**: وەك واتــای بنجـی بریتیــە لــە (کوانــوو) بــۆ هــەردوو بــاڵی (فرەواتــایی) و (واتاخوازی)، کێشەی ڕەگێشەی هەردوو باڵەکە بە یەکالاکردنەوەی (واتای بنجی) یـەکلایی دەبێتـەوە. بـە ئـەم پێیـە، هـیچ واتایـەکی خـوازراو نیـە و هـیچ فرەواتاییـەك نیـە، کـە لـە هیچەوە پەیدا بووبێت.

لە نەخشەی (٢/٥)دا، هەر کارێك کە هەر سێ ئاستەکەی هـەبێت، بـۆی هەیـە کـە یەکێك لە ئەو سێ واتایە ون بووبێت و بە ئاسانی نەدۆزێتەوە. هەر لەبەر ئـەوە، دیـاردەی واتادانەوە زۆر ئاڵۆزە، چونکە واتا هەیە لەدایك دەبێت، یان لـە دایـك دەبێـت و ئـەوەی تـر دەخاتـەوە، بـەڵام زۆر دوور نیـە کـە واتایـەکی بنجی مردبێـت و ئـەوەکانی مابێتنـەوە لـە



منتدى إقرأ الثقافي

ئەلبوومی زمانەکەدا. بە ئەم پێیە، واتای خـوازراو شـارەزاییەکی زۆر زۆری ئـەوێ، چـی لـە فۆلکلـۆر و چـی لـە لـە کەلـەپووری زارەکـی کوردەواریـدا. بـە ڕاسـتی، (ئـەنجامی ڕووداو) و (پـەیامی ڕووداو) بـریتین لـە ئـەو پلاتفۆرمـەی کـە لـە سـەری واتـای خـوازراو (خـوازە + ئیدیۆم) دادەمەزرێت.

**٢/٥: واتای ئیدیۆم[٢٤]:**

مامۆستا (جەلال مەحموود عەلی) زنجیرە کتێبێکی جوانی نووسیوە بە ناونیشانی (ئیدیۆم لە زمانی کوردیدا) و ئـەلبوومێکی جوانی دروسـتکردوە بـۆ ئیـدیۆم. لە پێشەکی کتێبەکەیدا پێناسەیەکی پێشکەشکردوە، وەك: (**ئیدیۆم پێکهاتنێکی تایبەتی و ئـاڵۆزە، کە لە یەکگرتنی هەندێك وشە واتایەکی تایبەتی پەیدا دەبێت، کـە لـەماناکانی لـە وشـە نزیـك دەبێتــەوە**). پاشـان، دوو پێناســەی تــری وەرگرتــوە بــۆ ئیــدیۆم لــە نووســەرانی تــرەوە. یەکەمیان مامۆستا (نەسرین فەخری)، کە دەڵێت: (**ئەومیە کە ڕاستە و ڕاست ناوی تشتێك نەدەیت، بەڵکو ناوی تشتێکی تر ببەیت، کە پەیوەندی بە مانایەکەوە هەبێت، بـۆ ئـەوەی پیاو لە مانا باسکراوەکەوە بۆ مانا مەبەستە هێما بۆ کراوەکە بچێت**). دووەمیـان مامۆسـتا (عەزیز گەردی)، کە دەڵێت: (**ئەومیە وشەیەك یان دەستە وشەیەك بهێنێت، کـە واتایـەکی دروستی خۆی هەبێت هەر لە ئەو کاتەدا لە ڕستەکەدا مانایەکی تـر بـدات بـە دەسـتەوە و مەبەست لە ئەم مانایەی دوایی بێت، دیسان دەشێت واتا دروست و نەژادیەکەت مەبەسـت بێت**). بـە هـەمان شـێواز مامۆسـتا ئیبراهیمـی ئەحمـەدی هـەر دوو پێناسـەکەی کینایـە و خوازەی لـە یـەکتری جوداکردوەتـەوە و نموونـەی زۆر وردی بـەراوردکردوە. ئەمـە و زانـای گەورە (پاڵمەر) سەبارەت بە ئیدیۆم دەڵێت: (لە سەرنجی ئیدیۆمێکدا، وەك " Kick the bucket" واتـای ڕیـزە وشـەکە تاریکـە و ئـەو واتایـە پەیوەنـدی نیـە بـە واتـای هـەر

[٢٤] لە پاشماوەی ئەم بەشەدا، زوومی توێژینەوە دەخەینە سەر واتادانەوەی کاری (شکان، شکاندن). لـە ئـەم ڕووەوە، نووسینێك بلاوکراوەتەوە بە ناوی (واتادانەوەی کاری شکان لـە ئاخاوتنی کوردەواریـدا)، گۆڤـاری ئاسـۆی فۆلکلـۆر، ژمارە (١٨)، هەولێر ٢٠٠٦. توێژەران دەتوانن کەڵکی لێ وەربگرن.



منتدى إقرأ الثقافي

وشەیەکەوە بە تەنها، بەڵام هەندێك جار نزیکترە لەواتای تەنها وشەیەك). بۆ نموونە ئـەو ئیدیۆمە بەرانبەر بە واتای کاری (مردن) هاتوە. پاشان، گوتراوە: ئـەو ڕیـزە وشـەیە هـەر چـەندە واتـای وشـەیەك هـەڵ دەگرێـت، بـەڵام وەك تـەنها وشـەیەك ناچـێتە نێـو ڕێـزی ڕستەوە، چونکە:

**یەکەم:** دەمکاتی ڕستەکە هەر لە کارەکەدا دەردەکەوێت نەك لە ڕیزە وشەکەدا.

**دووەم:** نیشانەی کۆ پەسەند ناکات.

لـە راسـتیدا، هـەر چـەندە ئـەو مامۆسـتایانەی پێشـەوە بـە وردی پێناسـەی واتـای خوازراویـان کردبێـت، ئێمـە پێناسـەکەی (پاڵمـەر) بـە شـیاوتر دەزانـین، چـونکە پشـتی بـە ڕێزمـان بەسـتوە. لـە لایـەکی تـرەوە، ئێمـە دەڵـێین: **هـەر ئیـدیۆمێك لـە مێـژووی خۆیـدا دەرەنجامێك، یان سکێچێك، یان پەیامێکی کاریگەر، هەڵ دەگرێت. ئەو پەیامەیش بوە بـە هـۆی پەیـدابوونی ئیدیۆمەکـە.** بـۆ نموونـە، بەرانبـەر بـە نموونەکـەی (پاڵمـەر)، چـەند ئێدیۆمێك هەیە کە بۆ کاری (مردن) بەکار هێنراون، وەك:

مل شکان: (ملی شکا ← مرد)

دەم دان بەیەکدا: (دەمی دا بەیەك دا ← مرد)

زمان کەوتنە لادەم: (زمانی کەوتە لادەمی ← مرد)

ساردبوونەوە: (سارد بوەوە ← مرد)

هاتن بە لادا: (هات بە لادا ← مرد)

ماڵ ناوایی کردن: (ماڵی ناوایی کرد ← مرد)

سەرنانەوە: (سەری نایەوە ← مرد)

چاولێك نان: (چاوی لێك نا ← مرد)



منتدى إقرأ الثقافي

سەرنجی ئەم ئیدیۆمانە دەری دەخات، كە زمانەكەمان چەند سەنگین و ڕەنگینـە، بەلاّم چەند بێ خزمەتە لە ئەم سامانە خۆماڵیەدا. لە گەڵ ئەوەیشدا، ئێمـە دەڵێین: هـیچ ئیدیۆمێك لە هیچەوە پەیدا نـەبوە لـە زمانەكـەدا. بـۆ نموونـە، ئـەم زاراوانـە لـە دیمـەنی كەسانێكەوە خوازراون، كە لە نان و ساتی سەرەمەرگدابن، وەك:

- مل شكان: مل خواربوونەوە یان مل نەگرتن.
- دەم دان بە یەكدا: مردوو بۆ دوا جار دەمی دەوەستێت لە جوولە و لە هەناسە پێ دان.
- زمانی كەوتە لادەم: مردوو زمانی دەكەوێتە لادەمی بە تایبەتی ئەگـەر لـە سـەرلا گیـانی دەرچووبێت.
- ساردبوونەوە: ئاساییە كە پلەی گەرمی لە شی دادەبەزێت لە پلەی گەرمی ئاسـایی لەشـی مرۆڤ. وەك دەگوترێت (چایەكە سارد بوەوە و بوو بە دەمی مردوو).
- هاتن بەلادا: دانیشتوویەك كاتێك دەمرێت دەكەوێت بە لایەكدا.
- سەرنانەوە: لەكاتی مردندا سەشۆڕ دەبێتەوە بۆ سەر زەوی.
- چاولێك نان: كەسێك، كە دەمرێت پیلۆوی چاوی ناترووكێت و قەتیس دەوەستێت.

بە ئاشكرا دیارە، كە وەك وێنەیەكی فۆتۆگراف، یان وەك شریتێكی ڤیدیۆیی، ئـەم ئیدیۆمانە لە ئەو دیاردانەوە خوازراون كە لە مـردوودا ڕوو دەدەن. زۆر جاریش لەوانەیـە ئەو ئیدیۆمـە لـە ڕووداوێكـەوە هاتبێـت، وەك (مـل شـكان یـان مـل شـكاندن)، چـونكە هـەر كەسێك كە ملـی بشكێت لـە ڕووداوێكـدا، بێـشك دەمرێـت، چـونكە پـەیامی ڕووداوی ئاوهـا وەك فـەرمانی مـەرگ وایـە. ئەمـە و لـە ڕووی ڕێزمانـەوە، چاوگی (مـل شـكان) سـێ بـاری شیاوی هەیە، وەك:

مل شكان: چاوگی بنجی (شكان)، تێنەپەڕ

مل شكاندن: چاوگی ئاندن (شكاندن)، تێپەڕ

مل شكێنـران: چاوگی بكەرنادیار (شكێنـران)، تێنەپەڕ



منتدى إقرأ الثقافي

لە ئێرەدا، کاری (مل شکان) لە گەڵ واتای ئیدیۆمەکەدا دەڕۆن. لە لایـەکی تـرەوە، دیاردەیەکی تر هەیە کە زۆر سەیرە. ئەویش ئەوەیە کە دوو واتای جیاواز هەبێت بۆ یەك ئیدیۆم، یان واتای ئیدیۆمێك لە سەر ئیدیۆمێکی تر ڕۆنرابێت، وەك:

ڕۆیشتن + هیوای مەرگ ← مل شکاندن

واتـە، ئەگـەر کەسـێك سـەفەر بکـات، بـەڵام تـۆش لـە دڵتـدا هیـوای مـەرگی بـۆ بخوازیت، بۆ ئەوەی نەگەڕێتەوە، دەڵێیت: (فلان ملی شکاند). ئەم واتایـە تـەنها لـە ڕێـژەی (ئاندن)دا هەیە، چونکە (مل شکان یان مل شکێنران) واتای کاری (ڕۆیشتن) نابەخشن. لـە لایەکی ترەوە (مل شکاندن: ڕۆیشتن) بەڕێزمان تێپـەڕە و بـە واتـا تێنەپـەڕە، کەچـی (مـل شکاندن: مردن) بە واتا و بە ڕێزمان تێپەڕە. وەك:

ـ مل شکاندن: (ڕۆیشتن + هیوای مەرگ):

تاوانبارەکە مل (ی) شکاند : (واتە، تاوانبارەکە ڕۆیشت). وەك لە بەشی چـوارەمدا باسکرا، لە ئێرەدا بەرکاری (مل) هەرسکراوە لە واتای کاری (شکاندن)دا.

ـ مل شکاندن: (مراندن: کوشتن):

پاسـەوانەکە ملـی دزەکـە (ی) شـکاند، (واتـە، پاسـەوانەکە دزەکـەی کوشـت)، بـە پێچەوانەی ئەوەی لە بەشی چوارەمدا باسکرا، لە ئێرەدا بەرکاری (مل) هەرس نەکراوە لـە واتای کاری (شکاندن)دا، چونکە وەك هەر بەرکارێکی ئاسایی جووتە سەر کاری (شکاندن).

لە ئێرەدا، سەرنجێك هەیە و دەبێت تۆمار بکرێت، ئـەویش ئەوەیـە کـە (تێپـەڕ و تێنەپەڕی واتایی) بە هێزی تێپەڕینی ئەو کارە دیاری دەکرێت کـە ئیدیۆمەکـە دەچێتەوە سەری، وەك:

مل شکاندن ← ڕۆیشتن : (تێنەپەڕ)

مل شکاندنی لایەنێك ← کوشتن : (تێپەڕ)



منتدى إقرأ الثقافي

وەك (مل شکاندن) لە هەر دوو واتاکەدا تێپەڕە بە ڕێزمان، بەڵام لە یەکەم جاردا دەبێت بە تێنەپەڕی واتایی. چونکە کاری (ڕۆیشتن) تێنەپەڕە، بەڵام لە دووەم جاردا، کە دەچێتەوە سەر (کوشتن) هەر تێپەڕە، چونکە کاری (کوشتن) تێپەڕە. ئێستایش کاتی ئەوە هاتوە کە ئاڵۆزیەکانی ئەم ئیدیۆمە تۆمار بکەین، تا بزانرێت کە زمانەکە چەند ئاڵۆزە و چەندە پێویستە بە تۆژینەوەی زانستی. بۆ نموونە، ڕستەی (مل شکاندن) مەگەر هەر بە هێزی (تێنەپەڕ/تێپەڕ)ی ڕستەکە بتوانرێت هەردوو واتاکە لە یەکتری جودا بکرێنەوە، چونکە ئەم جۆرە واتایە پشت بە ڕێزمان دەبەستێت، وەك:

(١):تێنەپەڕی واتایی:

ئازاد ملی شکاند: (واتە، ئازاد ڕۆیشت).

(١): تێپەڕ:

ئازاد ملی نەوزادی شکاند: واتە، ئازاد بوو بە هۆکارێك بۆ مل شکاندنی نەوزاد. بە واتایەکی تر، ئازاد نەوزادی گەیاند بە سزایەکی سەخت لە چەشنی سزای مەرگ.

ئەمە بوو سەرەتایەك بۆ ئیدیۆم وەك یەکەی واتاسازی ژێرخاندار. لە کۆپلەکانی داهاتوودا، ڕوو دەکەین لە واتای خوازراو بە گشتی و نموونەکان دابەش دەکەین بە سەرچەند خێزانێکدا، وەك: (واتای خوازراو بە ئیدیۆم، واتای جوێنی سپی، واتای خوازراو بە شوبهاندن).

**٣/٥، پەیام لە سەربوردەی ئیدیۆمەکاندا:**

لە ئەم جۆرە واتایەدا، ڕووداوی ڕاستەقینەی کارەکە لە ئارادا نیە، بەڵام پەیام و سەروبەندی ڕووداوەکە وەرگێراوە بۆ واتایەکی دی. بۆ نموونە، کاری (شکان) لە واتای بنجیدا چەند سیمایەك هەڵ دەگرێت. وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

بکەر: تشتێکی ڕەق (دار، بەرد، ئێسك، شووشە، خشت، ...).

بەرکار: نیە.

پاشەڕۆك: دەنگ.

ئەنجام: دوولەت بوونی تشتێك (بکەر).

پەیام: دەشێت (پەیامێکی رەش) لە ئەنجامی ڕووداوەکەدا هەبێت.

ئەم واتایە زۆر جار بە ڕووداوی پتەو و ڕاستەقینە ڕوو دەکات لە ئەندامەکانی لەش، وەك: (دەست شکان، پشت شکان، مل شکان، لووت شکان،...). ئێستا، دەتوانین ئەو چوار بەکار هێنانە شلۆڤە بکەین، وەك:

(١): کاری (دەست شکان):

واتای بنجی کاری (شکان) لە (دار و بەرد)ەوە پەرەی سەندوە بۆ شکانی ئێسکی دەست. پاشان، هەنگاوی ڕۆژگار و ژیرەمۆی کوردەواری دەری خستوە، کە ئەو کەسەی. کە دەستی بشکێت، نامرێت بەڵام ئیشی پێ ناکرێت. کەواتە، سەرگوزشتەی کاری (دەست شکان) بوە بە پەیامێکی ناخۆش و لە پاشتردا بوە بە (ئیدیۆم)ێك، کە خەڵکی بەکاریان هێناوە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیشیان پێ ناکرێت و هەر دەبێت بە مجرۆیی سەیری دەستی خەڵکی بکەن. بۆ نموونە، کە دەگوترێت (دەستم شکا) دوو واتا هەیە، وەك:

| دەستی شکا (واتای بنجی و نزیك) | دەستی شکا (واتای ئیدیۆمی و دوور) |
|---|---|
| دەست شکان. بە دوو لەت بوونی ئێسکی دەست و پێویست بوون بە چارەسەری نۆژداری. | بێ ئیش بوون، بێ دەسەڵات بوون، وەك سەرگوشتەی (بکەر) لە واتای بنجیدا. |



منتدى إقرأ الثقافي

**(٢): کاری (پشت شکان):**

واتای خوازراوی ئەم کارە لەسەر گوزشتەی ئەو کەسانەوە پەیدا بوە، کە پشتیان دەشکێت و نامرن. ئـی دی لەسـەر جێگـا دەکـەون بـەبێ جووڵـە هـەتا ڕۆژی مـردن. لـە ڕاسـتیدا، جۆرە سـەروبەندی ئاوها ئەوەنـدە کاریگـەرە و ئەوەنـدە جێـی داخـە، شایسـتەی ئەوەیە کە بکرێت بە واتایەکی خوازراو بۆ ئەو کەسانەی کە کەسێکی دڵسۆزیان دەمرێت، کە وەك (پشت) بوە بۆیان، وەك:

| پشتی شکا (واتای بنجی و نزیك) | پشتی شکا (واتای ئیدیۆمی و دوور) |
|---|---|
| واتـای بنجـی (پشـت شـکان) لـە ڕووداوێکدا و پەککەوتن لە نێو جێدا. | واتای خوازراو بە واتای بێکەس بوون و بێدەسـەڵات بـوون، وەك سەرگوزشـتەی (بکەر) لە واتای بنجیدا. |

**(٣): کاری (مل شکان):**

کاتێـك، کـە ڕووداوی فیزیـاوی (مـل شـکان) ڕوودەدات، بکـەری ڕسـتەکە بێشـك دەمرێت و ژیانی تەواو دەبێت. ئەم واتایەیش خوازراوە بۆ واتای کاری (مردن)، وەك:

| ملی شکا (واتای بنجی و نزیك) | ملی شکا (واتای ئیدیۆمی و دوور) |
|---|---|
| واتای بنجی ڕووداوی مل شکان و مردن بەهۆی ئەو ڕووداوەوە. | مردنی ئاسایی، بەبێ (شکانی مل)، وەك سەرگوزشتەی (بکەر) لە واتای بنجیدا. |

**(٤): کاری (لووت شکان):**

ئـەم واتایـە، لـە واتـای بنجـی ڕووداوی (لـووت شـکان)ەوە هـاتوە. بـۆ نموونـە، کەسـێکی لـووت بـەرز و گـەلۆر، هـەر دەڕواتـە پێشـەوە و هـەر لـووت دەژەنێـت لـە ئیشـی خـەڵکی، پاشـان تووشـی پەرچـە کـرداری (لـووت شـکان) دەبێـت، بـە دیوارێـك، یـان (بـە



منتدى إقرأ الثقافي

مشتەکۆڵەی کەسێك). ئیدی ئەو کەسە تەریق دەبێتەوە و ئەو کەش و فشەی نامێنێت. کە پێش ئەو ڕووداوە هەی بوە. لە پاشتردا، ئەم واتا پتەوەیش خوازراوە بۆ کەسانی لووت بەرز و ملهوڕ و فشەچی. کە هەتا نەگەن بە ڕووداوی (لووت شکان لەبەر چاوی خەڵکی) واز لە ڕەفتاری خراپیان ناهێنن، وەك:

| لووتی شکا (واتای بنجی و نزیك) | لووتی شکا (واتای ئیدیۆمی و دوور) |
|---|---|
| ڕووداوی ڕاستەقینەی لووت شکان و خوێن پژان. | ڕووداوی واتایی وەك کەش و فش نەمان و ناقڵ بوون، وەك سەروبەندی (بکەر) لە واتای بنجیدا. |

لە کۆی ئەم چوار واتایەدا، دەتوانین نموونەیەك بخەینە ڕوو: ئەگەر لە گوزەری بازاڕێکدا وەستایەکی ئەگریس هەبێت و ئەو وەستایە شاگردێکی کارامە و برایەکی دڵسۆزی هەبێت و خۆشی زۆر لووت بەرز بێت لە ئیشەکەیدا. لە ئاستی ئەم وەستایە، دەتوانین هەر چوار واتاکە ڕیز بکەین، وەك:

**یەکەم**: کاتێك، کە شاگردی وەستاکە ئیشە بەجێ دەهێڵێت، دەگوترێت: (وەستا جوامێر دەستی شکا).

**دووەم**: کاتێك، کە برا دڵسۆزەکەی دەمرێت، دەگوترێت: (وەستا جوامێر پشتی شکا).

**سێیەم**: کاتێك، کە چەند وەستایەکی دی لە بازاڕەکەدا پەیدا دەبن و گرەو لە وەستا جوامێر دەبەنەوە و ئیدی کەش و فشی نامێنێت، دەگوترێت: (وەستا جوامێر لووتی شکا).

**چوارەم**: کاتێك، کە وەستا جوامێر دەمرێت، یان تووشی ڕووداوێك دەبێت کە بارتەقای مەرگ بێت و خەڵکەکەیش زۆر حەزیان لە چارەی نەبێت. دەگوترێت: (وەستا جوامێر ملی شکا).

لە ڕاستیدا، لە کۆی ئەم نموونانەدا، چەند ڕاستیەك هەیە، وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

**یەکەم**: هەبوونی ڕووداوی فیزیاوی لە یەکەم ڕوودانـدا: تا ڕووداوی (دەست شکان، پشت شکان، مل شکان، لووت شکان) ڕوویـان نـەدابێت. ئـەو واتایانـە نـەکراون بـە (بنـەتا) بـۆ واتایەکی پایەدار و بەشکۆتر لە واتای بنجی.

**دووەم**: ئـەو چوار واتایـە، وەك لـە یەکـەم جاردا ڕووداوی ڕاستەقینەیان هـەبوە، پـەیامی ڕاستەقینەیشیان هـەبوە و ئـەو پەیامـە رەشـەی بـوە بـە گریژەنـەی واتـا ئیدیۆمیـەکان، نەخشەی (٣/٥).

**سێیەم**: کاتێـك، کـە ئـەو ڕووداوە فیزیاویانـە دەبـن بـە (پـەیام)، ئـەو پەیامانـە دەبـن بـە (سەرگوزشتە) بۆ (ئیدیۆم).

**چوارەم**: لە ئەو چوار ئیدیۆمەدا، تەوەری واتـا تازەکـە لـە سـەر واتـای (بـەرکار)ی (دەست، پشت، مل، لووت) دەگـەڕێت، چونکە شـکانی هـەر یـەکێك لـە ئـەو ئەندامانـە پـەیامێکی کاریگـەر و جیـاوازی هەیـە. کەواتـە، واتـای بنجی پـەیامی کاریگـەری بەخشیوە و واتـا و پەیامی کاریگەریش واتای خوازراوی کردوە بە (نێدیۆم).

| ڕووداو | پەیام : (تەوەرەی واتای خوازراو) |
|---|---|
| دەست شکان | لە کار وەستان، بـێ دەسـەڵات بوون (دەست هەڵواسین بە ملدا) |
| پشت شکان | بە تەواوی لە کار و جووڵە کەوتن (لەسەر جێگا کەوتن تا مردن) |
| مل شکان | مردن، نەمانی هیوا بە ژیان |
| لووت شکان | تـەریق بوونـەوە و کـەش و فـش فرێدان (هاتنەوە سەر باری ئاسایی) |

نەخشەی (٣/٥): چالاکی کاری (شکان) لە واتاسازیدا.



منتدى إقرأ الثقافي

**٤/٥: جوێنی سپی:**

بە ڕاستی، بابەتی جوێنی سپی جۆرێكی سەربەخۆ نیە، چونكە دیوێكە لە واتای خوازراو، چونكە زۆر جار لە واتای خوازراوەوە ڕوو دەكرێت لە (جوێنی سپی). واتە، ئەو جوێنانەی، كە بە ڕەوالّەت (جوێن) نین، كەچی بە ناوەڕۆك واتای (جوێن) هەلّ دەگرن. لە ئەم جۆرە جوێنەدا زۆر جاران پەنا دەبردرێت بۆ جۆرێك لە (ناوەلّناو) لە ناوی (بكەر)دا، وەك:

(١): ملشكاو: ئەو (ملشكاو)ە نەهات

(٢): شاخشكاو: ئەو (شاخشكاو)ە نەهات

ئەمە و بەكارهێنانی وشەی (ملشكاو)، یان (شاخشكاو)، لە جیاتی (جێناو)ێك، یان لە جیاتی (ناوەلّناو)ێك، ناخی تووڕە و بێزاری ڕستە پێكهێنەرەكە دەردەخات. لە وشەی (ملشكاو)دا، خۆزگای مەرگ دەخوازرێت لە ناخەوە. یان لە وشەی (شاخشكاو)دا (پێكهێنەر)ی ڕستەكە جوێنێك بە ئەو كەسە دەدات، چونكە خۆزگای بۆ دەخوازێت كە وەك ئاژەلّی (شاخشكاو)، لە شەڕەنگێزی و شەڕەقۆچ بوەستێت. لە لایەكی دیەوە، زۆر جار وشەی (هەلّگیراو) بۆ جوێنی سپی بەكار دەهێنرێت. خۆ وشەی (هەلّگیراو) هیچ جوێنێكی تێدا نیە، ئەگەر بە واتای بنجی لێك بدرێتەوە، بەلاّم جوێنێكی گەورەی تێدایە، ئەگەر بە واتای خوازراو لێك بدرێتەوە. لە ڕاستیدا، گەڕانەوە بەجێی پێی ئەم جوێنەدا پانوڕامایەكی بەرەواژی دەوێت، وەك:

**یەكەم**: كاری (گرتن) پێشگری (هەلّ)ی وەرگرتوە و بوە (هەلّ گرتن). بێگومان، كاری (گرتن) و ڕوخسارەكەی دیكەی هەردوویان واتای بنجی دەبەخشن و ڕووداوی پتەو دەنوێنن. وەك:

گرتن ← (مسك) بە عەرەبی

هەلّ گرتن ← (رفع) بە عەرەبی



منتدى إقرأ الثقافي

**دووەم**: واتای کاری (هەڵ گرتن)، بـە فرەواتـایی بەرکارەکەی گۆڕیـوە لـە (بـەرد) و (دار)ەوە بەرەو هەڵ گرتنی (گیانلەبەر) و (مرۆڤ)، وەك: (هەڵ گرتنی منداڵ بە باوەش). بێگومـان، واتای (منداڵ هەڵگرتن) زۆر پتەوە ڕووداوێکی فیزیاوی دەنوێنێت.

**سێیەم**: پاشان، دەتوانرێت بگوترێت: (سوارەکە کچێکی هەڵ گرت). واتە. کچەکە سوار بـوو لە پشت سوارەکەوە و باری نەسپەکە بـوو بـە دوو کـەس. بێگومـان لـە ئێرەیشـدا ڕووداوی پتەو هەیە و ڕووداوی (هەڵ گرتن) بە شێوەیەکی ڕاستەقینە هەیە.

**چوارەم**: لە پاشتردا، سەرەنجام و پەیامی هەڵ گرتنی کـچ بـوە بـە ئیـدیۆم بـۆ تەوانـەی کـە ڕەدوو دەکەون. واتە، کاری (کچ هەڵ گرتن) لە واتای بنجیدا هیچ نهێنیـەك هـەڵ ناگرێـت، بەڵام لە واتای ئیدیۆمدا چوەتە بەرانبەر (ڕەدوو کەوتن و ڕەدوو خستن).

**پێنجەم**: لە پاش ئـەوەی کـە کـاری (هـەڵ گـرتن) واتایـەکی تـازەی وەرگرتـوە، واتـای (هـەڵ گـرتن) بـە تـەواوی نـەماوە، چـونکە (ڕەدوو کـەتن) زۆر جـار نـە ئەسـپی دەوێـت و نـە ئۆتۆمبیلی دەوێت بۆ (هەڵ گرتن).

**شەشەم**: ئەمجار، ڕێژەی بکەرنادیار خـۆی خسـتوە بەسـەر ئـەو کـارەدا و کـاری (هـەڵ گـرتن) ڕووی کردوە لە (هەڵ گیران). لە ئەم کارەیشەوە، ناوەڵناوی (هەڵ گیراو) پەیـدا بـوە. کەواتـە، لە یەکەم جاردا، واتایەکی بنجی پەیدا بوە بۆ (هەڵ گرتن). پاشان، هەر (هـەڵ گـرتن)ێـك لـە ئەو چەشنە بوە بە (پەیام) و ئەو پەیامەیش بوە بە (ئیدیۆم). ئەمجار ئەو ئیدیۆمە بوە بـە جوێنێکی سپی لـە چەشـنی (هـەڵ گـیراو). ئەگـەرنا، واتـای بنجـی وشـەی (هـەڵ گـیراو) هـیچ لەنگی و نەنگیەك هەڵ ناگرێت. بە هەمان شێوە. لـە (ملشـکاو) و لـە (شاخشـکاو)دا، نـە ملـی شکاو هەیە و نە شـاخی شـکاو هەیـە، بـەڵام پـەیامێکی ڕەش هەیـە. سـەرەڕای ئـەم نموونانـە، جـوێنێکی سـپی هەیـە، وەك: (هـەی بـە پەنـد بیـت). یـان، وەك ناوەڵنـاو دەگوترێـت (هـەی بەپەندبوو). لە ڕاستیدا، ئەم نموونەیە خۆی لە خۆیدا ئەو میکانیزمە دەردەخات. کـە چـۆن هـەر واتایـەك لـە پەیامێکـەوە پەیـدا بـوە و ئـەو پەیامـەیش بـوە (پەنـد)ێك و چـوەتە نێـو



منتدى إقرأ الثقافي

سامانی زارەكی پێشینانەوە و پاشینانیش ڕۆژانە دەی لێنەوە. بە راستی، واتای بنجی ئاوێنەی بالاڕوانی واتا (ئیدیۆم)ە، چونكە دەتوانین بە راستەوخۆیی سەیری ڕووداوی كارەكە بكەین و (واتای بنجی) بە راستەخۆیی مەزەندە بكەین، یان سەیری ناو ئاوێنەكە بكەین و دیوی پشتەوەی واتاخوازراوەكە بە ئاشكرا ببینین. ئەمە و لە ئاستی واتای خوازراودا دەشێت میللەتان كەڵك لە یەكتری وەربگرن، چونكە سیمای سەرتاسەریان هەیە. بۆ نموونە، كارەكانی (دەست شكان، مل شكان، پشت شكان، لووت شكان...) هەمان پەیامی كاریگەریان هەیە لە سەر هەموو بەندەی سەر رووی زەوی.

### ٥/٥: واتاخوازی بە شوبهاندن:

لە واتای ئیدیۆمدا، وەك (دەست شكان، پشت شكان، مل شكان، لووت شكان)، دەشێت ڕووداوی راستەقینە هەبێت، وەك: (ئازاد دەستی شكا و چوو بۆ لای دكتۆر). بە پێی ئەوەی كە لە پێشتردا باسكرا، دەشێت بگوترێت: (ئازاد دەستی شكا). واتە، شاگرد و كرێكارەكان بەجێیان هێشت و ئیدی وەك (دەستشكاو) بەبێ ئیش دادەنیشێت. سەبارەت بە واتای شوبهێنراو، لە كاری (چاوشكان)دا ڕووداوی فیزیاوی نیە، وەك: (ئازاد چاوی شكا). لە ڕاستیدا، شۆڕكردنی چاو شوبهێنراوە بە شكانی (دەست، مل، پشت، لووت)، چونكە جۆرێك لە وێكچوون هەیە. ئەگەرنا، (چاو) ناشكێت وەك (ئێسك). كەواتە، كاری (چاو شكان)، یان (چاو شكاندن) بە میكانیزمی (شوبهاندن) گەیشتوە بە واتایەكی تازە لە ئەلبوومی (واتادانەوە)دا. ئەمە و كاری (شكاندن) بڕشتی زۆرە، وەك:

دڵ شكاندن: شیلان دڵی شكاوە لە ئازاد
ڕوو شكاندن: بۆچی شیلان ڕووی ئازادی شكاند؟
پۆت شكاندن: شیلان پۆتی ئازادی شكاند



منتدى إقرأ الثقافي

بە ئەم پێیە بزافی (شوبهاندن) دەرگایەکی گەورە دەکاتەوە بۆ (واتای خوازە)، کە پشت دەبەستێت بە (وێکچوونی دوو ڕووداو). بە پێچەوانەوە، ڕستەی (ئیدیۆم) پلەیە بەرزترە، چونکە دوو واتا دەداتەوە. یەکەمیان کۆنترە و ڕووداوی ڕاستەقینەی تێدا هەیە، کەچی ئەو مانایە جێی مەبەست نیە، بەلام دووەمیان واتە واتا خوازراوە تازەکەیە، کە جێی مەبەستە، چونکە دەگوترێت: (تازە هات، کۆنە خەلاتە). بەراستی واتای ئیدیۆم (واتا تازەکە) شارەزایی زمانی دایکی پێویستە لە تێگەیشتندا، چونکە تازەترە و ئاستەکەی بەرزترە لە ئاستی (فێربوونی زمانی دووەم).

**٦/٥: نموونەیەك لە شیکاردا:**

لە کارێکی وەك (شەکر شکاندن)دا دوو واتا هەیە. یەکەمیان بریتیە لە واتای کۆن و پتەوی (شەکر شکاندن بە شەکرشکێن[٢٥])، وەك چۆن ئافرەتی کورد شەکری کەلە هورد دەکەن و دەی کەن بە کلۆ، بۆ ئەوەی لەگەڵ چای دیشلەمەدا بەکار بهێنرێت. لە واتای دووەمدا، کاری (شەکر شکاندن) بریتیە لە واتای نەرم و شلی (ئاخاوتنی ناوەختی کەسێکی گێل و قسەزل). لە ئەم هەلوێستەدا، واتا بنجیەکە گرنگ نیە و هەر منداڵێکی چاوگەش دەتوانێت ڕستەی (شیلان شەکر دەشکێنێت بە شەکرشکێن) شلۆفە بکات، وەك:

شیلان: بکەر

شەکر: بەرکار

دەشکێنێت: کار (ڕێژەی ڕانەبردوو)

بە ... : ئامرازی پەیوەندی بۆ کەرەستە

شەکرشکێن: کەرەستەی ڕووداوی کارەکە

ئەنجام: دوولەت بوونی بەرکار

پەیام: دەشێت پەیامێکی ناجۆر هەبێت لە سەربوردەی کەسێکدا

[٢٥] شەکرشکێن، تێشەیەکی بچووکە تایبەتە بە شکاندنی شەکری کەلە (کەللە شەکر) بۆ شەکری کلۆ، تا بکرێتە شەکردانەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

سەبارەت بە واتای دووەم، کێشەکە وا ئاسان نیە، چونکە نە ڕووداوی (شەکر شکاندن) هەیە و نە (شەکری کەللە) هەیە و نە تێشەی (شەکرشکێن). لە ڕاستیدا، واتای خوازراوی (شەکر شکاندن) زۆر زۆر ئالۆزە و بە ئەم میکانیزمەدا تێپەڕیوە.

**یەکەم:** جاران دیوەخان هەبوە و لە دیوەخاندا قەنداو و چایی خوارەوەتەوە و شەکری کلۆ بەکار هێنراوە بۆ چای (دیشلەمە). لە ئەو جێیانەدا، کە جێی کۆبوونەوە و جێی کات ڕابواردن بوە، هەموو چشتێك باسکراوە. ڕەنگە کەسێك هەبووبێت لە دیوەخاندا کلۆ شەکرێك، یان شەکرۆکەیەکی هەڵ گرتبێت و بەددان شکاندبێتی. لە هەمان کاتدا، ئەو کەسە، لە گەڵ شکاندنی کلۆشەکرەکەدا، قسەیەکی کردوە، کە زۆر گەوجانە و گەمژانە بوە و بوە بە هۆی بزرکاندنی کەش و هەوای دانیشتنەکە. ئەمجار، ئەو کەسە هەر شەوێك کە هاتوە بۆ دیوەخان، لەگەڵ شەکر شکاندنی راستەقینەدا (بە دان)، دەمی بۆ گفتی زۆر بێ کەڵك و ناوەخت بردوە. هەر لەبەر ئەوە، ڕەنگە پێی گوترابێت: فەرموو برا شەکرێك بشکێنە، بە واتای (گەرجایەتیەك بنوێنە).

**دوەم:** ئەو گەوجایەتیەی کە ئەو کەسە کردوویەتی، بوە بە (ناکامێکی بێزەون) بۆ کاری (شەکر شکاندن). واتە، ئەو کارە بنجی و پتەو بوە، بەلأم ئەنجامەکەی ناشیرین بوە و بوە بە قسەیەکی نەستەقی کوردەواری.

**سێیەم:** پەیامی ئەو سەرگوشتەیە بوە بە واتایەکی سەرگوزشتەیی و بوە بە (ئیدیۆم) بۆ دەسپێکی هەر گفتێکی ناشیرین، کە لە دەمی کەسانی گەوج و ساویلکەوە، لە وەخت و ناوەختدا، لەناو خەڵکدا گۆبکرێت.

**چوارەم:** ئەم واتاخوازراوە زۆر لە چالاکی رستەسازیدایە و بەکارهێنانی هێشتا هەرماوە، وەك:

- ئازاد شەکرێکی شکاند (ئازاد دەمی کردەوە بە گەوجی)
- ئازاد شەکرێك بشکێنە (ئازاد دەم بکەرەوە بە گەوجی)
- ئێستا ئازاد شەکرێك دەشکێنێت (ئێستا ئازاد دەم دەکاتەوە بە گورجی)



منتدى إقرأ الثقافي

كەواتە، لە واتایەكی بنجیەوە، وەك (شەكر شكاندن بە ددان: شەكر داكرۆشتن)، پەیامێك پەیدا بوە، كە گەوجایەتی تێدا هەبوە. پاشان، ئەو پەیامە ناشیرینە، یان دەنگی خرمەخرمی شەركرشكاندنەكە بوە بە هێمای واتایەكی ئیدیۆم، چونكە پلەیباكی ئەم چیرۆكە زۆر نەستەق بوە. بەلأم رەوانبێـژێكی كوردەواری، لە نان و ساتی خۆیدا، دای هێناوە. كەواتە، ئەگەر بە وردی و بە زرنگی لە پێكهاتە بینراو و نەبینراوەكانی واتای (بنجی) وردببینەوە، ئەوا بە جوانی لە واتای ئیدیۆم و لە واتای خوازراو تێ دەگەین. لە واتای (ئیدیۆم)دا یەك (رستە) هەیە، بەلأم دوو واتا هەیە، یەكەمیان بنجیە و دووەمیان نابنجیە. بەلأم واتا نابنجیەكە زالترە. چونكە لە سەر (پەیام)ی واتا بنجیەكە رۆنراوە. نەك لە سەر پێكهاتە بنجیەكانی. لە واتای (خوازراو)دا یەك (رستە) هەیە و یەك واتا هەیە، بەلأم (وێكچوون: شوبهان) هەیە لە گەڵ واتا بنجیەكە.



منتدى إقرأ الثقافي

## بەشی شەشەم
## واتاسازی لە پاشگری دووپاتی (ەوە)دا

لە كتێبی (ڕێزمانی پاشگری دووپاتی ەوە)دا، هەولێر (٢٠٠١)، بە هوردی و بە جوانی لە جۆرەكانی واتای ئەو پاشگرە دواوین و گرنگیەكی بەرفراوانمان داوە بە ڕێزمانەكەی. لە بەشی كۆتایی ئەو كتێبەدا، هەموو جۆرە واتاكان لە خشتەیەكدا كۆ كراونەتەوە. لە ساڵی (٢٠١٦)دا، لە كتێبێدا بە ناونیشانی (سێ مۆركی ڕێزمانی كوردی)، جارێكی تر پێداچوونەوە و تازەكردنەوە بۆ دوو بابەت كراوە كە لە ساڵی (١٩٩٩)دا بڵاوكراونەتەوە. ئەو دوو بابەتە دەلیڤەیەكی باشیان بۆ ئێمە ڕەخساندوە كە جارێكی تر بیر و بۆچوونەكانمان بكەونەوە بەر زاو و زێ و بیرۆچكەی تازەتر و شیاوتر بخەینە بەردەستی توێژەرانی دوارۆژ. لە ئەم بەشەی ئەم كتێبەی بەردەستدا، ڕەچاوی بیر و بۆچوونەكانی نێو كەرتی سێیەمی ئەو كتێبە دەكەین و جارێكی دی و بە چەشنێكی دی لە ئەو بابەتە دەدوێین. لە نەخشەی (١/٦)دا، هەموو جۆرە واتاكانی پاشگری دووپاتی (ەوە) ڕیز دەكەین لە سێ ڕێچكەی پان و لە شەش ڕاڕەوی واتاییدا. لە كۆپلەكانی داهاتوودا هەموو ڕاڕەوە واتاییەكان بە جودایی وەردەگرین.

### ١/٦: دووپاتی بە وچان:

لە ئەم جۆرە واتایەدا، واتای كارەكە ناگۆڕێت بەڵام ڕووداوی كارەكە دووبارە دەبێتەوە. بۆ نموونە، كە دەگوترێت: (دیسان، منداڵەكە كەوتەوە)، (دیسان، منداڵەكە نوستەوە)، واتای دووبارە بوونەوەی ڕووداوەكە زۆر ئاشكرایە، چونكە كەرەستەی (دیسان) بەكار هێنراوە. كەواتە، منداڵەكە جارێك كەوتوە و لە پاش وچانێكی تر دیسان كەوتوەتەوە. یان، منداڵەكە جارێك نوستوە و لەپاش وچانێكی دی دیسان نوستوەتەوە، وەك:

(كەوتن: وچان: كەوتن) ← (كەوتنەوە)

(نوستن: وچان: نوستن) ← (نوستنەوە)



منتدى إقرأ الثقافي

بێگومان، ڕووداوی كارەكە دەبچرێت و وچانێك دەچەسپێت و پاشان دەست پێ دەكاتەوە. بە واتایەكی دی، ڕووداوی كارەكە جارێكی دی واژ دەكاتەوە.

| ڕارەوە واتاییەكان | ڕێچكە پانەكان |
|---|---|
| (١): دووپاتی بە وچان | دووپاتی و دژواتایی |
| (٢): دووپاتی بە نیوسووڕ | |
| (٣): دووپاتی بە سووڕ | |
| (٤): واتای ئەنجامدان تا دواتنۆك | واتاگۆڕین بە شێوازی ڕوودان |
| (٥): واتای بزاڤ و بڵاوبوونەوە | |
| (٦): واتای بووژاندنەوە | واتا ژیاندنەوە |

نەخشەی (١/٦): واتاگۆڕین بە پاشگری دووپاتی (ەوە).

**٢/٦: دژواتایی بە نیو سووڕ:**

لە هەموو ئەو كاردانەدا، كە (دژ واتا) یان (دژ ئاراستە)یان هەیە، پاشگری (ەوە) ئاكاری دژواتایی زاڵ دەكات، وەك:

شیلان كراسەكەی فرۆشتەوە: (دژ واتای كڕین)

شیلان كراسەكەی كڕییەوە: (دژ واتای فرۆشتن)

شیلان ڕۆیشتەوە: (دژ واتای هاتن)

شیلان منداڵەكەی بردەوە: (دژ واتای هێنان)

شیلان دابەزیەوە: (دژ واتای سەركەوتن)

شیلان هاتەوە: (دژ واتای ڕۆیشتن)

لە نێوان دوو ڕستەی دژواتادا، وەك (شیلان ڕۆیشت) و (شیلان هاتەوە)، ڕووداوی ڕستەكە نیو سووڕی (١٨٠ پلەیی) هەیە و لە واتای ڕستەی دووەمدا دەردەكەوێت، كە بریتیە لە ڕستەی (شیلان هاتەوە)، وەك لە نەخشەی (٢/٦)دا نیگاری بۆ سازكراوە. بە واتایەكی



منتدى إقرأ الثقافي

دی. لە نەو نەخشەیەدا كلكی تیری دوەم سەربەخۆ نیە و بەستراوە بەسەری تیری كارێكی دژ واتاوە (تیری یەكەم).




نەخشەی (٢/٦): دژواتایی بە نیو سووڕ.

**٣/٦: دووپاتی بە سووڕ:**

لە ئەم جۆرە واتایەشدا، ڕووداوی كارەكە دووبارە دەبێتەوە، بەڵام وچانەكە بە كارێكی دژ واتا پڕ دەبێتەوە. بۆ نموونە، ئەگەر گوترا: (دیسان، شیلان نامەكەی ناردەوە)، دەشێت میكانیزمێك بچەسپێت لە چەشنی: (ناردن + وچان + ناردن ← ناردنەوە). لە گەڵ ئەوەیشدا، دەشێت ئەو وچانە بە كارێكی دژ واتا پڕ بكرێتەوە، وەك (هێنانەوە) (ناردن + هێنانەوە + ناردن ← ناردنەوە). ئێستایش دەتوانین بابەتەكە بە ناراستەی تیرەكان ڕوون بكەینەوە، نەخشەی (٣/٦).




نەخشەی (٣/٦): دژواتایی بە سووڕی تەواو.



منتدى إقرأ الثقافي

لە ئەم نموونانەدا، چەند سەرنجێك هەیە، وەك:

**یەکەم**: لە نموونەیەکدا، وەك (شیلان نامەکەی نارد)، ڕووداوەکە یەكلۆیە بەرەو دوور دەڕوات (بۆ لای چەپ).

**دوەم**: لە نموونەیەکدا، وەك (شیلان نامەکەی هێنایەوە)، ڕووداوی کارەکە بوە بە دژ واتای (ناردن)، (بۆ لای ڕاست)، وەك لە کۆپلەی (٢/٦)دا باسکرا.

**سێیەم**: لە نموونەی سێیەمدا، جارێکی دی ڕووداوی کاری (ناردن) دووبارە بوەتەوە، (دیسان بۆ لای چەپ)، وەك لە کۆپلەی (٢/٦)دا باسکرا.

**چوارەم**: ئەو سێ تیرە سووڕێکی (٣٦٠ پلە) پێك دەهێنن، کە دەبێت بە سووڕێکی تەواو.

**پێنجەم**: ئەگەر بابەتی (دووپاتی بە وچان/ کۆپلەی ١/٦) و بابەتی (دووپاتی بە سووڕ/ئەم کۆپلەیەی بەردەست) بەراورد بکەین، دەبینین کە جۆری یەکەم ڕێچکەی ڕووداوەکەی دەبێت بە دوو پارچە، بەڵام لە جۆری دوەمدا هەر دوو پارچەی ڕێچکەکە بە یەکەوە بەستراون لە سووڕێکی تەواودا.

**٤/٦: واتای ئەنجامدان تا دواتنۆك:**

لە ئەم جۆرە واتایەدا تەسکبوونەوە هەیە و کارەکە لە کارێکی ڕەها و گشتیەوە دەبێت بە کارێکی بەند و تایبەتی. بە واتایەکی دی، ئاگاری ئەنجامدانی سەت لەسەت دەهێنێتە کایەوە، وەك: (بڕین: بڕینەوە، سڕین: سڕینەوە، مان: مانەوە، گەیشتن: گەیشتنەوە، پەڕین: پەڕینەوە). بە سەرنجێکی ورد و ژیرانە، دیارە کە کارەکانی (بڕین، سڕین، مان، گەیشتن، پەڕین) ڕادەی سەدی لە ئەنجامدانی ڕووداوەکەیان پێشان نادەن، بەڵام کارە دوولۆیەکان (بڕینەوە، سڕینەوە، مانەوە، گەیشتنەوە، پەڕینەوە) ئەو ڕادەیە پێشان دەدەن بە (١٠٠٪). واتە، کاری یەکلۆی (بڕین) واتاکەی ڕەهایە و گشتی و فراوانە بۆ ڕووداوی (بڕین)، بەڵام کاری دوولۆی (بڕینەوە) واتاکەی بەند و تایبەتی و بەرتەسکە بۆ بڕینی گردەبڕ و دەراودەر. یان دیواودیو. بۆ نموونە، هەموو کەسێك هەست بە ئەوە دەکات، کە لە ڕستەی (تۆ دارەکەت بڕییەوە)دا، دوولەت بوونی دارەکە مەرجە و دەبێت بچەسپێت. یان، لە ڕستەی (شیلان تەختەکە بسڕەوە)دا، سڕینەوەی گشت ڕووبەری تەختەکە مەبەست و مەرجە و دەبێت بچەسپێت.



منتدى إقرأ الثقافي

**٥/٦: بزاڤ و بڵاوبوونەوە:**

لـە هەنـدێك کـاری زمانەکـەدا، پاشـگری دووپـاتی (ەوە) بـزاڤ و بڵاوبوونـەوەی ڕووداوی کارەکە دەخاتە نێو واتاکەوە. واتە، بڵاوبوونەوەی بەرەبـەرەیی دەهێنـە کایـەوە و واتاکەیش دەبێت بە واتایـەکی بەنـد و تایبـەتی و بەرتەسك، وەك: (بـزووتن: بزووتنـەوە، جـوولان: جوولانــەوە، چـوون: چـوونەوە، سـووڕان: سـووڕانەوە).لە ڕاسـتیدا، لـە نموونـە دوولۆیەکاندا، بزاڤ پەیدا بوە و ڕووداوی کارەکە بە چەشنێك دەچەسپێت، کـە داینـامیزمی تێـدا هـەبێت، یـان بـە ڕێـتم بـڵاو ببێتـەوە. یـان، دەتـوانین بڵـێین، ڕوودانـی کارەکە وزە و چالاکی تێ دەکەوێت. بۆ نموونە، ئەگەر کـاری یـەکلۆی (جـوولان) بخەینـە بەرانبـەر واتـای (جوولانــەوە) دەبیـنین، کـە لـە (جوولانــەوە)دا، وزەیـەك پەیـدا بـوە و ئاکـاری ڕیتمێکـی بەردەوامی داوە بە ڕوودانی کاری (جوولان).

**٦/٦: ژیاندنەوەی واتا:**

لـە نێـو زمانـەکـەدا هەنـدێك لـە کارەکـان بـاری یـەکلۆیان نیـە و تـەنها هـەر بـاری دوولۆیان هەیە، وەك:

(بووژانــەوە: بـووژان*، پاڕانــەوە: پـاڕان*، پیشـانەوە: پیشـان*، پووکانــەوە: پووکـان*، توانەوە: توان*، ڕازانەوە: ڕازان*، گەشانەوە: گەشان*، پەرچـانەوە: پەرچـان*، ڕەوانـەوە: ڕەوان*، کووژانەوە: کووژان*، نوشـتانەوە: نوشـتان*، گواسـتنەوە: گوازسـتن*، هۆنینـەوە: هۆنین*، ...

ئەمە و دەیان کاری لە ئەم چەشنە هەیە و هەموویان لە چالاکی بەکارهێنانـدان. لە گەڵ ئەوەدا، وا پێ دەچێت کە ئەو کارانە بریتیبن لە ئاسەواری چـەند کـارێکی یـەکلۆی سست، کە ئێستا برەوی واتاییان نەماوە. بـۆ نموونـە، ئەگـەر پاشـگری دووپـاتی (ەوە) هـەڵ بگـرین لـە ئـەو کارانـە، ئـەوا پێڕێـك لـە کـار پەیـدا دەبـن، وەك: (بـووژان، پـاڕان، پیشـان، پووکان، توان، ڕازان...)، کە هیچ واتایەکی پوخت نابەخشن بەبێ پاشـگری (ەوە) . لـە ئـەم هەڵوێستەدا، بە ئاشکرا دیـارە، کـە ئـەو ڕوخسـارە یەکلۆیانـە بـێ واتـان، کەچـی ڕوخسـاری دوولۆیان واتادارە.



منتدى إقرأ الثقافي

**٧/٦: نموونەیەك لە شیکاردا:**

لە ئەم کۆپلەیەدا، دەمانەوێت واتاکانی پاشگری (ەوە) لە یەکتری بترازێنین بە نیگاری ئەندازیاری. بۆ نموونە، لە نەخشەی (٤/٦)دا هەر سێ واتای بنجی یەکلۆ و دژواتایی و واتای دووپاتی لە یەکتری جودا دەکەینەوە:




نەخشەی (٤/٦): نموونەیەك لە شیکاردا (هاتن، ڕۆیشتنەوو، هاتنەوە).

**یەکەم**: ڕێچکەی ڕاستەهێڵی (أب) واتای بنجی و یەکلۆی کاری (هاتن) دا دەپۆشێت.

**دوەم**: واتای کاری دوولۆی (ڕۆیشتنەوە) ڕێچکەی (أب جـ د)دادەپۆشێت، چونکە پاشگری (ەوە)ی وەرگرتوە و ئەو پاشگرەیش ناکاری (دژواتایی)ی چەسپاندوە. واتە، کاری (ڕۆیشتنەوە) واتای (هاتن و ڕۆیشتنەوە) دەبەخشێت.

**سێیەم**: کاری (هاتنەوە) واتای دووبارەبوونەوەی کاری (هاتن) دەبەخشێت، چونکە تیری (أب) یەکسانە بە تیری (هـ و) بە (ڕووکار). هەر لەبەر ئەوە، واتای (هاتن و ڕۆیشتنەوە و هاتنەوە) چەسپاوە. بەڵام هەردوو کاری (هاتن و ڕۆیشتنەوە) لە ژێر لێودان. بە واتایەکی دی، کاری دوولۆی (هاتنەوە) ڕێچکەی (أب جـ د هـ و) دادەپۆشێت.

**چوارەم**: ئەگەر تیری (هاتن : أ ب) لابدەین، ئەوا تیری (جـ د) واتاکەی دەگۆڕێت بۆ (ڕۆیشتن). پاشان، کاری (هاتنەوە) ڕێچکەی (ج هـ د و) دادەپۆشێت و واتای (دژواتایی) دەچەسپێت.



منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی هەفتەم

## ڕووماڵێك بۆ واتـادانەوەی کاری یەکپات ( گرتن )

**١/٧: دەستپێك:**

لە ڕێزمـانی کـاری (گـرتن)دا، بزاڤـی فرەواتـایی زۆر زۆر چوسـت و چـەلەنگە، بـە ڕادەیەك زۆر زۆر ئەستەمە کە کێوماڵ بکرێـت و ئـەمجا نەخشـەڕێژ بکرێـت لـە کتێبێکـدا، یان لە فەرهەنگۆکێکدا. هەرچی چۆنێك بێت، لە ئەم بەشـەدا دەکەوینـە کردەوکۆشـەیەکی بەرفراوان بۆ خاکـەڕۆکردنی بابەتەکە و بـۆ چنینەوەی زێـڕی ئـەم کـارە گرنگـە، چـی لـە ئاخاوتنی کوردواریدا و چی لە دەقـە نووسـراوەکاندا. لـە پاشـەڕۆژدا، دەشـێت ئـەوەی نـوێ، دەیان هەزار، یان زیاتر. لە لاپەڕەی تایپکراو کۆ بکەنەوە (بە سۆفت) لە دەزگاکانی چاپ و بلاوکردنەوەوە، وەك دەزگای ئاراس و دەزگای سەردەم و ئەوانەی تـر. لـە پاشـتردا، لـە ئـەو ڕووبەرە گەورەیەدا بۆ ماکەکانی کاری (گرتن) بگەڕێن بە (find)، وەك پارچولکەی (گـر) و (گیر). لە ئەم کێوماڵەدا، لە دەقی جیاوازەوە و لـە نووسـەری جیـاوازەوە نموونـەکان ڕیـز دەبـن و ئـەوەی کـە بـیری توێـژەری بـۆ ناچـێت کۆمپیووتەرەکـە دەی دۆزێتـەوە و ڕیـزی دەکـات. پاشـان، توێـژەر دەتوانێـت گەمەیـەکی بلیمەتانـە دابمـەزرێنێت لـە نێـوان ئـەو نموونانـەدا، چـونکە ڕێگاکـەی زۆر بـۆ کـورت دەبێتـەوە و نموونـە جیاوازەکـان خـۆ نمایش دەکەن لە ئەو ڕستانەدا کە تێیاندا نیشتەنین. بە ڕاستی، لە سەر پێوانـەی ماکـەکانی کـاری (گرتن)، دەشێت هـەمان دەقـی زەبـەلاح بـە کـار بهێنرێـت بـۆ ماکـەکانی هـەر بابـەتێك کـە زوومی پشکنینی خرابێتەسەر. هـەر لـە سـەر ئـەو دەقـە تـایپکراوە، بـە مـەرجێك ژمـارەی لاپەڕەکانی یەکجار زۆربێت، دەشێت ناوەندێکی توێژینەوەی بۆ دابمەزرێنرێت و بـە دەیـان قوتابی ماستەر و دکتۆرا ئیشی تێدا بکەن، بەلام لە ژێر سەرپەرشتی پرۆفیسۆرە توێـژەر و کتێبنووسـەکانی زمـانی کوردیـدا. ئەمـە و لـە نەخشـتەی (١/٧)دا، هەنـدێك لـە ئـەو واتـا بەرچاویانەی کاری (گرتن) ڕووماڵ دەکەین و لە کۆپلەکانی داهاتوودا شیکاری ڕێزمـانی و



منتدى إقرأ الثقافي

واتاسازییان بۆ دەکەین. لە سەرەتادا، کاری یەکپاتی (گرتن) وەردەگرین و لە پاشتردا، واتە لە (بەشی هەشتەم)دا، کاری دووپاتی (گرتن + ەوە) دەخەینە بەر شیکار.

| فرەڕوخساری | فرە بەرکاری | واتاخوازی |
|---|---|---|
| گرتن | دەستگرتن | دەست گرتن |
| هەڵ | جێ گرتن | ڕێ گرتن |
| گرتن | توخم گرتن | زمان گرتن |
| داگرتن | خۆ گرتن | دەم گرتن |
| ڕاگرتن | زمان گرتن | سەرگرتن |
| وەرگرتن | پێ گرتن | خۆ گرتن |
| بەرگە | دەم گرتن | سەرگرتن |
| گرتن | یەك گرتن | جێ گرتن |
| .... | .... | گۆشت گرتن |
| | | .... |

**خشتەی (١/٧): بزاڤی واتادانەوە لە کاری (گرتن)دا**

**٢/٧: کاری یەکپات (گرتن):**

لە بەر ئەوەی کاری یەکپاتی (گرتن) بەردی بناغەیە بۆ دیوی دووپاتی کاری (گرتنەوە)، لە سەرەتادا کاری (گرتن) مامەڵە دەکەین، چی لە فرەواتاییدا و چی لە فرەڕوخساریدا، چونکە ئەم کار ژمارەیەك لە پێشگرە واتاگۆڕەکان وەر دەگرێت و واتای تازە دادەهێنێت، وەك (هەڵگرتن، داگرتن، ڕاگرتن، وەرگرتن، ...) . لە گەڵ ئەوەیشدا، ئەم کارە زۆر چالاکە لە بواری واتاگۆڕکێدا بە کۆلکەی (بەرکاری ڕێزمانی)، وەك (بەرگەگرتن، زمانگرتن، مانگرتن، ...). سەرەڕای ئەمانە، ئەم ڕوخسارانەی کاری (گرتن) بۆیان هەیە بە چەندین میکانیزم واتای ئیدیۆم و واتای (خوازراو) دابهێنن.



منتدى إقرأ الثقافي

**٣/٧: واتای بنجی لە كاری (گرتن)دا:**

لە بنجیترین واتای كاری (گرتن)دا چەند سیمایەك هەیە، وەك:

(١): بكەر: كەسێكی ژیر و وزەدار.

(٢): بەركار: تشتێك یان گیاندارێك.

(٣): ئامرازی ڕووداو: دەست و پەنجەی بكەر.

(٤): ئەنجامی ڕووداو: بكەری ڕستەكە بەركارەكە پەیوەست دەكات بە خۆیەوە و دەبن بە یەك گورزە.

(٥): پەیامی ڕووداو: لە واتای بنجیدا، ئەگەر (پەیام) هەبێت، دەشێت (واتای خوازراو)ی لێوە پەیدا ببێت، بۆ نموونە، كاری (دەرگا گرتن بە دەست) پەیامی (قەدەغەكردنی هات و چۆ) دەبەخشێت، وەك لە واتای خوازراوی (ڕێگرتن) و (ڕێگر)دا دەچەسپێت[٢٦].

ئەمە و جێلەقبوونی هەر یەك لە ئەو سیمایانەی سەرەوە دەبێت بە هۆی جوولانی واتای كاری (گرتن) بەرەو دیوێكی تازەتر لە واتاكەی. لە بەرانبەردا، گۆڕینی ڕوخساری كاری (گرتن) بە هەر مۆرفیمێكی سەربار، وەك (هەڵ + گرتن)، دەبێت بە هۆی گۆڕینی واتای بنجی كارەكە بۆ واتایەكی تری (بنجی). بێگومان، ئەم واتا بنجیە نوێیەیش دەرگا دەكاتەوە بۆ بزاڤی واتاسازی، وەك كاری دایك (گرتن).

**٤/٧: واتاگۆڕین بە ڕوخسارگۆڕین:**

لە میكانیزمی فرەڕوخساریدا، هەر مۆرفیمێكی واتاگۆڕ كە دەچێتە سەر كارێك هەم واتاكەی دەگۆڕێت و هەم ڕوخسارەكەی. هەر لە بەر ئەو سەدەمە واتایەكی بنجی نوێ بنیاد دەنرێت لەر بناغەی واتا بنجیەكەی یەكەم. بۆ نموونە، پێشگرەكانی (هەڵ، دا، ڕا) بۆیان هەیە هەم ببن بە (ڕۆخسارگۆڕ) و هەم ببن بە (واتاگۆڕ) بۆ كاری هەمواركردنەوەی واتای (گرتن) بۆ واتاكانی (هەڵگرتن، داگرتن، ڕاگرتن):

---

[٢٦] ئەم بابەتە لە كۆپلەی (٥/٧)دا ڕوون دەكرێتەوە.



منتدى إقرأ الثقافي

**(۱): كاری (هەڵ گرتن، داگرتن، ڕاگرتن):**

لـە سـێتە پێشـگری واتـاگۆڕ (هـەڵ، دا، ڕا، ڕۆ)دا، كـاری (گـرتن) پێشـگری واتـاگۆڕ (هـەڵ) وەر دەگرێـت و واتایـەكی بنجی تـازەی لـێ پەیـدا دەبێت بەرانبـەر بـە (گـرتن بـە دەسـت + بەرزكردنـەوە)ی بـەركاری (منداڵەكـە)، وەك نموونـەی (۱) لـە خـوارەوە. لـە سـەر هەمان شێواز، كاری (گرتن) پێشگری واتاگۆڕ (دا) وەر دەگرێت و واتایەكی بنجی تازەی لـێ پەیدا دەكات بەرانبەر بە (گرتن بە دەسـت + نـزم كردنـەوە)ی بـەركاری (منداڵەكـە)، وەك نموونەی (۲). هەروەها، كاری (گرتن) پێشگری واتاگۆڕ (ڕا) وەر دەگرێت و واتایەكی بنجـی تازەی لێ پەیدا دەكات بەرانبەر بە (گرتن بەدەسـت و وەسـتاندن)ی بـەركاری (منداڵەكـە)، وەك نموونەی (۳).

| | |
|---|---|
| شیلان منداڵەكەی گرت ← | (۱): شیلان منداڵەكەی هەڵ گرت |
| | (۲): شیلان منداڵەكەی دا گرت |
| | (۳): شیلان منداڵەكەی ڕا گرت |

**(۲): كاری وەر گرتن:**

لـە سـێتە پێشـگری واتـاگۆڕ (سـەر، بـەر، دەر، وەر، لا)دا، كـاری (گـرتن) پێشـگری واتاگۆڕ (وەر) وەر دەگرێـت و واتایـەكی بنجی تازەی لێ پەیدا دەبێـت، بەرانبـەر بـە (گـرتن بەدەست + ڕادستكردن)ی بەركار (منداڵەكە)، وەك:

شیلان منداڵەكەی گرت : شیلان منداڵەكەی وەر گرت

**٥/۷: واتای خوازە لە ئەنجامی ڕووداوی كاردا:**

ئەم واتا نوێیە بریتیە لە جۆرێك لە (شوبهاندن). واتـە، ڕووداوی پتـەوی كارەكـە كۆپی دەكرێت بۆ ئەوەی بشوبهێنرێت بە واتای كارێكی دی، كە ڕووداوی ڕاستەقینەی تێدا نیـە. لـە كۆپلـەی (۳/۷)دا، لـە سـیمای (چـوارەم)دا ئـەنجامی ڕووداوی كـاری (گـرتن)



منتدى إقرأ الثقافي

ڕەچاوکراوە، وەك: (**بکەری ڕستەکە بەرکارەکە پەیوەست دەکات بە خۆیەوە و دەبن بە یەك گورزە**). کەواتە، کاتێك کە دەڵێن: (دیوارەکە پەڕۆکەی گرتوە)، بکەری ڕستەکە (دیوارەکە) نە زیندوە و نە وزەدارە و نە دەست و پەنجەی هەیە بۆ گرتنی بەرکاری (پەڕۆکە). سەبارەت، بە واتای خوازراو، پەیامی ئەم جۆرە نموونەیە کراوە بە (خوازە)، چونکە گشت سیماکانی کاری (گرتن) فڕێدراون و تەنها هەر ئەو ئەنجامە کراوە بە نامانج، تا دوو لایەنی (بکەر و بەرکار) پێکەوە پەیوەست ببن. لە لایەکی ترەوە، واتایەکی تری جیاواز هەیە، وەك: (ئەم دەفرە چەند گوێز دەگرێت). لە ئەم جۆرە واتایەدا، واتای ئەنجامی ڕووداوەکە دەچەسپێت، چونکە بەرینایی و بۆشایی دەفرەکە هەر ژمارەیەکی دیاریکراو لە گوێزەکان پەیوەست دەکات بە خۆیەوە. واتە، بکەری (دەفر) و بەرکاری (گوێز بە ژمارە) پێکەوە دەبن بە یەك گورزە و ئەوانی تر دەڕژێنە دەرەوەی دەفرەکە. کەواتە، ئەم جۆرە کارە واتای بەرینایی (Capacity) دەفرە جیاوازەکان (کیسە، فەردە، تا، هەمانە، لنگە، توورەکە، جاخ، جەواڵ، گوونێ، بەرمیل، شووشە، بوتلی غاز، چاڵاو، چاڵ، دەنگ، کەندوو، سایلۆ، تانکی، مەرکانە، سەتڵ، قوولینە، قاپ، ...) دیاری دەکات ، چی بە تشتی توند، چی بە تشتی شل، چی تشتی گازی لە ژێر پەستاندا.

**٦/٧: واتای ئیدیۆم لە پەیامی ڕووداوی کاردا:**

**(١): کاری (دەستگرتن):**

بۆ نموونە، لە کاری (دەستگرتنی نابینایەك)دا، ڕووداوی پتەوی کارەکە دەپارێزرێت و تەنها و تەنها گۆڕانکاری دەکەوێتە سەر سیمای بنجیەکانی واتا. لە ئەم کارەدا، ڕووداوی پتەو هەیە ڕووداوەکەیش هیچ مەبەستێکی پەنامەکی هەڵ ناگرێت و واتاکە زۆر ڕوون و بەرچاویە. بە واتایەکی دی، هەموو سیما بنجییەکانی کاری (گرتن) لە ئارادایە و واتای کارەکە بنجیە، وەك: (شیلان دەستی ئازادی گرت)، بەڵام ئەگەر واتای پتەو و فراوانی کاری (دەست گرتن) تەسك بکەینەوە بۆ (پەیامێکی پیرۆز)، ئەوا واتایەکی سەربار پەیدا دەبێت. بۆ نموونە، ئەگەر (ئازاد) نابینابێت و ئەو دەست گرتنەی (شیلان)



منتدى إقرأ الثقافي

مەبەستێك بپۆشێت بۆ (یاریدەدان)ی (ئازاد)، ئەوا سیمای (پەیام)، یان سیمای (پەیامی تایبەتی) دەهێتەكایەوە، وەك: (شیلان دەستی ئازادی نابینای گرت). لە ئەم نموونەیەدا، واتای بنجی دەچەسپێت، چونكە بە ڕاستی و بە دروستی (شیلان) دەستی (ئازاد)ی پەیوەست كردوە بە دەستی خۆیەوە، تا وەك یەك (پارچە) بەیەكەوە ڕێ بكەن. كەواتە واتای كاری (گرتن) تەسككراوەتەوە بە پەیامی ئەنجامدانی (دەست گرتن)، كە بریتیە لە (یاریدەدانی كەسێكی زەروور). پاشان، ئەگەر ڕوو بكەین لە واتای (ئیدیۆم)، دەبینین كە هەموو ڕووداوەكە فڕێ دراوە و پەیامە پیرۆزەكەی ئەنجامدانی ڕووداوەكە خراوەتە نێو واتایەكی نوێ بۆ ئیدیۆمی (یاریدەدان). ئەمە و بە سەرنجێكی ورد لە شیكارەكە دەردەكەوێت كە:

**یەكەم:** ئەگەر گشت سیماكانی كاری (گرتن) بخەینە بەر مەبەست، ئەوا واتای بنجی دەچەسپێت.

**دووەم:** ئەگەر بە سیمای تایبەتی (پەیام) واتاكە تەسك بكەینەوە، ئەوا واتایەكی سەربار دەچەسپێت. (دەستگرتن + پەیامێكی پیرۆز).

**سێیەم:** ئەگەر لە ڕووداوی پتەوی كارەكە گشت سیماكان فڕێ بدەین و تەنها سیمای تایبەتی (پەیامی ڕووداوەكە) بخەینە بەر ڕووناكی، ئەوا واتای (ئیدیۆم) دەچەسپێت.

**چوارەم:** بەپێی خاڵی دووەم لە سەرەوە، سیمای (پەیام) وا دەكات، كە بابەتەكە پلەیەكی دی پێش بكەوێت و ڕووبەرێكی دیكەی ڕەسەن لە ڕووبەری گەورەی واتا ئاشكرا بكرێت. لە سەر نەخشەی (٢/٧)، كاری (گرتن) بەركاری (دەست)ی وەگرتوە و بوە بە چاوگی تەرخانكراو بە بەركار (دەستگرتن)، لە كرداری دەستگرتنی كەسێكی نابینادا. ئەمەیان لە سەر باری ستوونی، بەلام لە سەر باری ئاسۆیی ڕووداوی كاری (گرتن) پووكاوەتەوە و واتایەكی ئیدیۆمی (بێ ڕووودان)ی داهێناوە لە سەر پەیامە پیرۆزەكەی ئەركی (یاریدەدان



منتدى إقرأ الثقافي

و دەستگیرۆیی). ئەوەیش لـە یـاد نەكەین كـە لـە ڕێزمـانی ئـەم كـارەدا بـەركاری ڕێزمـانی
(دەست) نابێت فەرامۆش بكرێت، چونكە واتای ئیدیۆمەكەی لە سەر دامەزراوە.




**نەخشەی (٢/٧): سەجەرەی ئیدیۆمی (دەستگرتن).**

بە شێوازێكی جیاواز لـە كارەكـانی (مـانگرتن، ڕۆژووگـرتن، لاگـرتن)، هەرچـەند
كـاری (دەسـتگرتن) خانـەی (بـەركار) پـڕ دەكاتـەوە بـە نـاوی (دەسـت)، بـەڵام خـۆی جیـا
دەكاتەوە لە ئەو كارانە. چونكە لە ئێرەدا كـاری (گـرتن) لـە ئـەركی یاریـدەدەردا نیـە و لـە
باری ڕستەسازی ئاساییدا بەركاری (دەست)ی گوزەراندوە. بە ڕاستی، لـە ئـەم جـۆرە كـارەدا
واتای (ئیدیۆم) دەهێتە كایەوە، چونكە بە هەردوو دیوەكەدا ڕستەی (شیلان دەستی ئازادی
گرتوە) واتادارە، چی وەك واتایەكی بنجی و چی بۆ واتایەكی خوازراو (باربوویكردن). لە
واتای بنجیدا پەیامی بەرز و پیرۆز هەیە بۆ یاردیدانی كەسێك بە دەستگرتنی ڕاستەقینە
تا لە ڕووداوێك دەرباز ببێت. لە دیوە ئیدیۆمەكەدا، ئـەو پەیامـە پـیرۆزە كـۆپیكراوە و بە
گشت كارێكی (باربوویكردن)، وەك: (بـە بڕێـك پـارە، شـیلان دەسـتی ئـازادی گرتـوە). لە
بەانبەردا، لە دیوی واتای بنجیدا دەگوترێت: (شیلان دەسـتی ئـازادی گرتـوە، تـا بیـەڕێنتـەوە
لە جادەكە). لە ئەم ڕوانگەیەوە، دەتوانین نەخشەیەكی تر دابڕێژین، نەخشەی (٣/٧).


منتدى إقرأ الثقافي




نەخشەی (٣/٧): ئیدیۆمی (دەستگرتن) بە نموونەوە.

لە نەو نەخشەیەدا چەند سەرنجێك هەیە:

**یەکەم:** لـە واتـای بنجیـدا، واتاکـە فراوانـە و گـرنـگ نەوەیـە، کـە (دەسـتی شـیلان و ئـازاد پەیوەست بن بەیەکەوە).

**دووەم:** لە واتای سەرباردا، باری فراوانـی واتاکـە تێـك دەچـێت و واتاکـە تەسـك دەبێتـەوە و سیمایەکی نوێ واتاکە تەرخان دەکات بۆ پەیامی (یاریـدەدان). لـە ئێـرەدا، گـرنـگ ئەوەیـە: (دەستی شیلان و نابیناکەکە بەیەکەوە چەسپ بن).

**سێیەم:** لە واتای ئیدیۆمدا، چەند ئاکارێك دەچەسپێن، وەك:

- ڕووداوی (دەستگرتن) نامێنێت، یان فرێ دەدرێت.
- پەیامی پیرۆزی (یاریدەدان) فراوان دەکرێتەوە بۆ واتایەکی ئیدیۆمیانە.
- واتای خوازراوی (دەستگرتن) فراوانە، هەموو جۆرە واتایەك دەگرێتەوە. واتە، مەرج نیـە ئەو کەسەی یارمەتی دەدرێت (نابینا) بێت یان (پەك کەوتوو) بێت. مەرجیش نیە جۆری یاریدەکە هەر یارمەتیدان بێت لە (ڕۆیشتن)دا.

**چوارەم:** لـە خـاڵی دووەمـدا، یارمەتیەکـە بریتیـە لـە (ڕێنمـایی)، لـە (ڕۆیشـتن)دا، یـان لـە پەڕینەوەدا. لە خاڵی سێیەمدا ڕێنمایی نەماوە و دەست گـرتن نیـە و یارمەتیەکـە بریتیـە لە (پارەو پوولی نەختینە. یان هـەر تشـتێکی بـەنرخ). کەواتـە، واتـای (سـەربار) تەسـکە و



منتدى إقرأ الثقافي

یەك جۆر یارمەتی مرۆیی پیشان دەدات، كە شایستەی ئەوەیە كە بكرێت بـە نموونەیـەكی (نەستەق) بۆ ئیدیۆمی یارمەتیدانی كەسانی ناچار و بیٚدەرامەت.

**(٢): كاری (دەرگا گرتن):**

لە نموونەیەكدا، وەك: (شیلان دەرگاكەی گرتـوە)، واتایـەكی بنجی دەچەسپێت و بكەری ڕستەكە و بەركاری ڕستەكە پەیوەست دەبن بە یەكەوە. واتە، ئەگەر واتـای ڕوون و شووشـەیی كـاری (گـرتن) بچەسـپێت و مەبەسـت هـەر تـەنها و تـەنها بـریتی بێـت لـە ئەنجامدانی ڕووداوی (گرتن)، ئەوا هیچ مەبەستێكی تایبەتی لـە ئـارادا نیـە. بـەڵام ئەگـەر سیمای (پەیام) پەیدا بوو، ئـەوا واتـای ڕسـتەكە بـە ئـەم چەشـنە ڕوون دەبێتـەوە: (شـیلان دەرگاكەی گرتوە بەدەست، تا نەكرێتەوە، یان تا دەرگاكە بـەڕەڵا نـەبێت، یـان تـا كـەس تـیٚ نەپەڕێت بە ڕێگاكەدا، یان بە دەرگاكەدا). لـە ڕاسـتیدا، كاتێـك كـە ڕووداوی (دەرگا گـرتن) پەیام هەڵ دەگرێت، واتا بنجیەكە تەسك دەبێتەوە و واتایەكی سەربار دادەهێنێت. لە ئـەم ڕووداوەدا، كــاری گـــرتنی ڕاســـتەقینە چەســـپاوە، وەك لەســـەر نەخشـــەی (٤/٧) ڕوون كراوەتەوە.

| جۆری واتا | نموونە: دەرگا گرتن |
|---|---|
| واتای بنجی | ـ بكەرێكی زیندوو وژیر و وزەدار (شیلان)<br>ـ بەركار، (دەرگاكە).<br>ـ دەستە بەرە. دەستی شیلان بریتیە لە ئامرازی گرتن.<br>ـ ئەنجام، پەیوەست بوون لە نێوان بكەر و بەركاردا. |
| واتای ئیدیۆم | ـ پەیام: قەدەغەكردنی هات و چۆ |

نەخشەی (٤/٧): واتای ئیدیۆم لە كاری (دەرگا گرتن)دا.



منتدى إقرأ الثقافي

ئەمە و ئەگەر لە ڕستەیەکدا هەموو سیماکان بێجگە لە (پەیام) جێ بوو، ئەوا واتاکە بنجییە و مەبەست تەنها ئەنجامدانی کارەکەیە. بەڵام ئەگەر سیمای تایبەتی (پەیام) هاتە کایەوە، ئەوا واتای کارەکە واتایەکی سەربار دەداتەوە. بەرانبەر بە ئەو دوو واتایە، ئەگەر سیمای (پەیام)، کە بریتیە لە (قەدەغە کردنی هات و چۆ)، کەوتە کار، ئەوا واتای ئیدیۆم پەیدا دەبێت:

- واتای بنجی (گرتن): ڕووداوی پتەو: شیلان دەرگاکەی گرتوە بە دەست.
- فرەواتایی کاری (گرتن): ڕووداوی پتەو بۆ پەیامێك: شیلان ئەو دەرگایەی گرتوە کە لە سەر ڕێگای هات و چۆیە، تا کەس بە ئەو ڕێیەدا نەڕوات.
- واتای خوازراوی (گرتن): بێ ڕووداوی پتەو، وەك: (شیلان ڕێی لە ئێمە گرتوە، ناتوانین هیچ بکەین).

**(٢): کاری (گرتن) لە ڕاوکردندا:**

لە نموونەیەکدا، وەك: (ئازاد کەوەکەی گرت) چەند سیمایەکی واتاسازی هەیە لە سەر چاوگی (کەو گرتن):

- بکەرێکی زیندوو و ژیر و وزەدار (ئازاد).
- بەرکارێکی زیندوو و وزەدار و بزێو (کەو).
- دەستەبەرە، ئامرازی گرتن بریتیە لە داو و دەست وپل.
- ئەنجام، پەیوەست بوونی بکەر و بەرکار بە یەکەوە.
- پەیام، لە ڕاوکردندا نێچیرەکە (بەرکار) دەبێت بە ماڵی (بکەر).

لە ئەو شلۆڤەکاریەدا، چوار سیماکەی سەرەتا واتای ڕوونی کاری (گرتن) پیشان دەدەن و تەنها ڕووداوی (گرتن) دەچەسپێت. بەرانبەر بە ئەم واتا بنجیە، ئەگەر سیمای پێنجەم بچەسپێت و بەرکاری ڕستەکە ببێت بە (نێچیری ڕاو)، ئەوا واتایەکی سەربار دەهێنێتە کایەوە. لە ئەو واتایەدا ئاوەژووبوونی (پەیامی گرتن: ڕاوکردن) خۆی دەردەخات



منتدى إقرأ الثقافي

و کاری (گرتن) لە ئاستی (بەرکار)ێکدا تەسك دەکاتەوە بۆ واتایەکی بەرتەسك و تایبەت. واتە، کۆی هەر چوار سیماکەی سەرەتا، کەتێیاندا بەرکارەکە (زیندوو وزەدار و بزێو)ە، شوبهێنراوە بە واتایەکی خوازراو لە چەشنی (نیشانە پێکان)، وەك دەگوترێت (گرتی). واتە، ئامانج و نیشانە پێکراوە و مەرازی ئاخێوەرەکە هاتۆتە دی. بۆ نموونە، کە کەسێك، بە ڕستەیەکی کورتیلە، دەڵێت: (گرتی)، لە واتای بنجیدا واتای کاری (گرتن) دەچەسپێت، وەك: (داوەکە کەوەکەی گرت). لە واتای خوازراودا، واتای بنجی کاری (گرتن) ناچەسپێت و پەیامی ڕووداوی (گرتن) دەچەسپێت و واتای (بردنەوە و دڵخۆشبوون) دەچەسپێت، وەك ئەوەی بڵێیت: (بەختەکەمان هێنای و خەڵاتەکەمان بردەوە)، یان (بەختمان نووسا بە خەڵاتەکەوە).

**٧/٧: هەرسکردنی واتای بەرکاری ڕێزمانی:**

ڕەنگە زێدەڕۆیی نەبێت ئەگەر بڵێین: لە زمانی کوردیدا، بزافی واتاسازی قەرزداری کۆڵکەی (بەرکاری ڕێزمانی)یە. لە ڕووی هەرسکردنی واتای بەرکارەوە، هەرەوەزیەك، یان سینێرژیەکی پتەو، هەیە لە نێوان (بەرکار) و (کار)دا بۆ داهێنانی واتایەکی نوێ، چونکە کۆڵکەی (بەرکاری ڕێزمانی) بە چەند رایەڵەکی زانستیدا شۆڕ دەبێتەوە و دا دەشلێتە نێو دەفرە نادیارەکانی (واتاسازی). بێگومان، ئەم جۆرە بابەتە ئاسکە مۆرکی واتاسازیەك هەڵ دەگرێت کە زۆر زۆر سەختە بە زانستی (واتاسازی) زمانە خزمەتکراوەکان ڕاڤە بکرێت، یان بە کاری تاکە کەسێك بە وردی لێك بدریتەوە، وەك:

**(١): کاری مانگرتن:**

ئەگەر کاری (مانگرتن) بکەین بە دەستکەلا، دەبینین کە هەندێك لە کارەکانی زمانی کوردی لە کرۆکەوە سیمای (پاریەدەدانی سینتاکسی) هەڵ دەگرن. واتە، خانەی (بەرکار) تەرخان دەکەن بۆ هەر (بەرکار)ێکی نابەرجەستەی بەجێ، بۆ وەرسووڕاندنی واتاکەی لە گەمەی ڕستەسازیدا، وەك کاری (مانگرتن). مەودای بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە



منتدى إقرأ الثقافي

کارە زۆر بەرفراوانە لە زمانی کوردیدا، وەك: (ڕۆژووگرتن، ئێشکگرتن، خۆگرتن، لاگرتن، خووگرتن، هۆگگرتن، ...)، بەلاّم بە ئەم ئەدگارانەی خوارەوە، ئەم جۆرە کارە لە کاری تر جودا دەکرێنەوە:

**یەکەم:** لە ڕووی ڕێزمانەوە، ئەم جۆرە کارە (تێپەڕ)ن بە جێناوی لکاوی (بکەر)، بەلاّم هەر شەش ڕستە دەخەنە ڕوو بۆ هەر شەش کەسە ڕێزمانیەکە، چونکە هەر یەك (بەرکار)ی نەگۆڕیان هەیە. وەك ناوی (مان) لە (مانگرتن)دا.

**دووەم:** وەك تیرۆژەیەك بۆ خالّی پێشوو، لە بەر ئەوەی ئەم جۆرە کارە لە سەر یەك (بەرکار) قفلّ دەبن و هەرسی دەکەن لە واتایەکی تازەدا، تەنها لە سەر (بکەر)ی شەش کەسە ڕێزمانیەکە دەگەڕێن و هەر شەش ڕستە پڕ دەکەنەوە بۆ بەرکاری تاقانە (مان)، وەك:

| بکەر | بەرکار | کار |
|---|---|---|
| من | (مان)م | گرت |
| تۆ | (مان)ت | گرت |
| ئەو | (مان)ی | گرت |
| ئێمە | (مان)مان | گرت |
| ئێوە | (مان)تان | گرت |
| ئەوان | (مان)یان | گرت |

**سێیەم:** لە پالێمی خالّی پێشوودا، ئەو جۆرە گەردانە لە گەردانی کاری (تێنەپەڕ) دەچێت، چونکە کاری تێنەپەڕی ئاسایی هەر شەش ڕستەی هەیە، بەلاّم کاری تێپەڕی ئاسایی، وەك (گرتن)، بۆی هەیە گەردانامەی (٢٨) ڕستە پڕ بکاتەوە، بۆ هەردوو جێناوی لکاوی (بکەر و بەرکار).



منتدى إقرأ الثقافي

**چوارەم:** بە پێ خاڵی پێشوو، ئەم جۆرە کارە لە کاری (ناتەواو) دەچن، چونکە:

(١): لە سەر یەك (بەرکار)، وەك (مان)، لۆککراون.

(٢): ناتوانن ئەو بەرکارە (مان) فەرامۆس بکەن لە ڕێزماندا.

**پێنجەم:** یان، لابردنی (بەرکار) لە ئەو جۆرە کارەدا دەبێت بە هۆی لابردنی واتاکەی، چونکە گەمە ڕستەسازیەکە لە سەر (واتای بەرکار) چەقی بەستوە. تەنانەت، لە فەرهەنگیشدا، دەبێت (بەرکار + چاوگ) بە کار بهێنین، وەك (مانگرتن).

**شەشەم:** کۆی ئەو خاڵانەی پێشەوە ئەو ڕایەڵە زانستیانە دەستنیشان دەکەن کە لە نێوان هەردوو ئاستی (ڕێزمان و واتاسازی)دا بە نادیدەیی هەیە.

## (٢): کاری ڕۆژوو گرتن.

وەك بۆ کاری (مانگرتن) باسکرا، کاری یاریدەدەر (گرتن) خانەی (بەرکار) پڕ دەکاتەوە بە ناوی (ڕۆژوو) بۆ ئەوەی واتاکەی هەرس بکات لە گەمەی ڕستەسازیدا و کارێکی تازە ڕیز بکات، وەك کاری (ڕۆژوو گرتن)، کە واتای تایبەتی خۆی هەیە لە فەرهەنگدا. ئەوەیش لە یاد نەکەین کە کاری (ڕۆژووگرتن)، وەك کاری (مانگرتن) سێتە ڕستەی خۆی هەیە بۆ هەر شەش کەسە ڕێزمانیەکە، وەك:

| بکەر | بەرکار | کار |
|---|---|---|
| من | (ڕۆژوو)م | گرتوە |
| تۆ | (ڕۆژوو)ت | گرتوە |
| ئەو | (ڕۆژوو)ی | گرتوە |
| ئێمە | (ڕۆژوو)مان | گرتوە |
| ئێوە | (ڕۆژوو)تان | گرتوە |
| ئەوان | (ڕۆژوو)یان | گرتوە |



منتدى إقرأ الثقافي

**(٣): کاری (لاگرتن):**

وەك بۆ هەردوو کاری (مانگرتن و ڕۆژووگرتن) باسکرا، کاری پاریدەدەر (گرتن) خانەی (بەرکار) پڕ دەکاتەوە بە ناوی ئاوەڵکاری (لا)، بۆ ئەوەی واتاکەی هەرس بکات لە گەمەی ڕستەسازیدا و کارێکی تازە ڕیز بکات، وەك (لاگرتن)، کە واتای تایبەتی خۆی هەیە لە فەرهەنگدا، وەك: (خۆ پاراستن لە ئەرکێك). ئەوەیش لە یاد نەکەین کە کاری (لاگرتن)یش سێتە ڕستەی خۆی هەیە بۆ هەر شەش کەسە ڕێزمانیەکە، وەك:

| بکەر | بەرکار | کار |
|---|---|---|
| من | (لا)م | گرتوە |
| تۆ | (لا)ت | گرتوە |
| ئەو | (لا)ی | گرتوە |
| ئێمە | (لا)مان | گرتوە |
| ئێوە | (لا)تان | گرتوە |
| ئەوان | (لا)یان | گرتوە |

**(٤): کاری زمانگرتن:**

لە ریزە نموونەیەکدا، وەك:

(کۆرپەلەکە سەری گرتوە)، (کۆرپەلەکە ملی گرتوە)، (کۆرپەلەکە پشتی گرتوە)، (منداڵەکە پێی گرتوە)، (منداڵەکە زمانی گرتوە)، چەند ئاکارێکی کاری (گرتن) دەکەونە بەرچاو. بۆ نموونە، لە کاری (زمانگرتن)دا ئەم سەرنجانە هەن:

- بکەر: زیندوو وزەدار لەگەڵ پلەیەك لە (ژیری).
- بەرکار: زمانی منداڵەکە.
- دەستەبەرە: ئامرازی گرتنی زمان کە بریتیە لە ماسولکەکان.



منتدى إقرأ الثقافي

- ئەنجام: كۆنترۆڵكردن و دابینكردنی جوولەی زمان بە (گرتن).
- پەیام: پەیدابونی بەهرەی زمان

لە ئەم جۆرە واتایەدا، زوومی واتاسازیانە خراوەتە سەر ناكاری (چوارەم)، كە بریتیە لە ئەنجامی رووداوی كارەكە، یان (كۆنترۆڵكردنی جوولە زمان بۆ بەرهەم هێنانی دەردووی كەڵكدار). بە شێوەیەكی زانستی ورد و ناسك، دەتوانین بڵێین: منداڵەكە دەتوانێت سەری بزوێن بلكێنێت بە كلكی نەبزوێنەوە و دەردووی (دادادا، بابابا) گۆبكات. لە ئەم واتایەدا، كاری (گرتن) واتای كۆلكەی (بەركار)ی هەرسكردوە و تەرخانی كراوە بۆ (زمان گرتنی منداڵی ساوا). لە پاشتردا، ئەو واتایە خوازراوە كراوە بە ئیدیۆم بۆ كەسانێك كە تازە تازە دەم دەكەنەوە و بەرسووی كەسانی گەورە دەدەنەوە. كەواتە، ئەو كەسانە لە پێشتردا زمان لە دەمیاندا نەبوە (وەك منداڵی زمان نەگرتوو) و ملكەچ بوونە بۆ ئامۆژگاری گەوران، بەلام ئێستا دەمیان گەرم بوە. لە ئەم نموونەیەدا، واتای فراوانی (زمان گرتنی منداڵ) لار دەبێتەوە بەرەو واتایەكی تایبەتی خوازراو بۆ (چەواشە بوون و دەرچوون لە ئامۆژگاری گەورەكان). لە نەخشەی (٥/٧)دا، لە واتای دووەمدا رووداوی كارەكە فرێدراوە و (واتای ئیدیۆم) پەیدا بوە (دەستەچەپ). لە نموونەكەی دەستە راستدا، رووودوێكی راستەقینە هەیە، بەلام لە نموونەكەی دەستە چەپدا، نە رووداوی راستەقینە هەیە و نە تازە تازە شیلان قسەكردن فێر دەبێت. بە كورتی، تا ئیدیۆمی (زمانگرتن: ناسەلاری) پەیدا بوە، دوو هەنگاوی واتاسازیانە لە پێشتردا چەسپاون، وەك:

**یەكەم**: كاری بنجی (گرتن) واتای بەركاری (زمان) هەرسكردوە و هەردووكیان پێكەوە كارێكیان داهێناوە بۆ (زمان پژانی منداڵی ساوا).

**دووەم**: كاری (زمان پژانی منداڵی ساوا) خوازراوە بۆ ئیدیۆمی زمانپژانی كەسانی هەراش بە (وەلامی ناجۆر و ناشایستە).



منتدى إقرأ الثقافي

| واتای بنجی سەربار | واتای ئیدیۆم |
| --- | --- |
| شیلان زمانی گرتوە<br>(ڕووداوی راســــــتەقینە + زمان پژان) | شیلان زمانی گرتوە<br>(بــێ شــەرمانە، شــیلان وەڵامــی گەورەكان دەداتەوە) |

نەخشەی (٥/٧): دوو واتا بۆ كاری (زمانگرتن)

لە رستەی یەكەمدا، منداڵەكە ئێستا دەتوانێت بە ماسولكەكانی زمانی خۆی ڕابگرێت. بە واتایەكی دی، زمانی منداڵەكە دەكەوێتە ژێر ركێف و كۆنترۆڵەوە. بە هەمان شێوە هەر منداڵێك چەند دیاردەیەكی ئاوهای هەیە، بەڵام بە پێی تەمەن، وەك: (سەرگرتن: سەرسووڕاندن، مل گرتن: سەر بەرزكردنەوە، پشت گرتن: دانیشتن، پێ گرتن: لەسەر پێ ڕاوەستان و هەنگاونان). لە ئەو نموونانەدا، بزاڤی (واتاگۆڕین بە كۆلكەی بەركار) چەسپاوە و واتای بەركاری (سەر، مل، پشت، پێ، زمان) هەرسكراوە لە رستەسازی كاری (گرتن)دا و ئێستا واتای كاری (گرتن) وەك كارێكی تێنەپەڕ وەر دەسووڕێت و ناتوانێت بەركاری رستەسازی وەربگرێت وەك هەر كارێكی تێپەڕی ئاسایی.

**(٥)؛ كاری (خۆگرتن)؛**

لە نموونەیەكدا، وەك: (شیلان خۆی گرت بە گالێسكەكەوە، تا نەكەوێتە خوارەوە). لە ئەم ڕستەیەدا، واتای بنجی دەچەسپێت، چونكە ڕووداوی پتەوی (گرتن) هەیە، وەك:

- بكەر: زیندوو و ژیر و وزەدار.
- بەركار: یەكسانە بە (بكەر)، جێناوی (خۆ).
- دەستەبەرە: دەستی شیلان بریتیە لە (ئامرازی گرتن).
- ئەنجام: پەیوەست بوونی (بكەر و بەركار) بە پێكەوە.
- پەیام: تا بكەر (شیلان) و بەركار (خۆ) نەكەونە خوارەوە و تووشی نەهامەتی نەبن.



منتدى إقرأ الثقافي

لە ئەم واتایەدا، واتابەستی بەرکار (خۆ) هەردوو کۆلکەی بکەر و بـەرکاری کـردوە بە یەك لایەن. لە دیوی واتای خوازراودا، پەیامی ڕووداوەکە وەرگێراوە، کە بریتیە لە (خـۆ پاراستن لە کەوتن)، وەك: (شیلان خۆی گرتوە). واتە، شیلان نـەی هێشتوە، کـە جەنگـەڵی ژیان زەفەری پێ ببات و ئێستا بەرخودان و خۆگرتوە. بێگومان، لە ئەم واتایـەدا، بـە هـیچ جۆرێك سیماکانی ڕووداوی کاری (گرتن) ناچەسپێت.

**٨/٧: گۆڕینی ئامرازی ڕووداو:**

**(١): کاری دیوارگرتن:**

لە کاری (دیوار گرتن)دا، بـە واتـای (پێـوە نووسـان)، جۆرێـك لـە (گـرتن) هەیـە و (ئامرازی گرتن) بریتی نیە لە (دەست و مەچەك)، بەڵکوو بریتیە لـە توانایـەکی خۆڕسـك لە خودی (بکەر) و (بەرکار)دا بۆ یەکتریگرتن، وەك: (پەرۆکە دیوارەکـەی گـرت). لـە ئـەم دیاردەیـەدا، ڕووبـەری ڕووکەشـی ریشـاڵەکانی (پـەڕۆ) یـەکجار فـراوان و بەرینـە بەهەمان شێوە، ڕووبەری دیواری زبر و گڕ و زۆر گەورەیە. لە ئەم هەڵوێستەدا، پەڕۆکـە و دیوارەکە یەکتری دەگرن بە بەهرەیەك، کە لە هەردوو چشتەکەدایە هەیە، وەك:

- بەرکار، چشتێکی گڕ و دڕ (دیوارەکە).
- بکەر، چشتێکی چنراو بە ریشاڵ.
- دەستەبەرە، ئاکارەکانی بکەر و بەرکار دەبن بە هۆکاری یەکتریگرتن.
- ئەنجام، پەیوەست بوونی بکەر و بەرکار بە خودی خۆیان.

لە دیوی واتای خوازراودا، ئەم واتا سەربارە شوبهێنراوە بە (توخم گرتن)، یان بـە واتـای (التلقـیح و الاخصـاب)، وەك دەگوترێـت: (ماینەکـە نـەی گرتـوە). واتـە، تـوخمی ئەسـپەکەی نـەگرتوە و ئـاوس نـەبوە. بێگومـان وشـەی (تـوخم) بریتیـە لـە (بـەرکاری واتابەست)ی کاری (توخم گرتن).



منتدى إقرأ الثقافي

**(٢): کاری گۆشت گرتن:**

کاری (گۆشت گرتن)، بە واتای قەڵەوبوون بۆ ئەو کەسانە دەگوترێت، کە لەشیان زۆر گۆشتن دەبێت و زیادە گۆشتیان پێوە دەردەکەوێت، وەك دەگوترێت: (ئازاد بۆ وا گۆشتی گرتوە). لە ڕەسەندا، ئەم ڕستەیە بریتیە لە: (لەشی ئازاد بۆ وا گۆشتی گرتوە). کەواتە، وشەی (لەش) کرتاوە و دیاردەی (گۆشت گرتن) ڕووی کردوە لە بکەری ڕستەکە (ئازاد). لە ئەم بەکارهێنانەدا، بابەتەکە شوبهێنراوە بە (دیوار گرتن)، باسکراو نەختێك لە پێشتردا. کەواتە، وەك پەڕۆیەك چۆن دەنووسێت بە دیواری زبرەوە، هەر ئاوهایش گۆشتی سەربار پەیوەست دەبێت بە کۆتەڵی لەشەوە.

**٩/٧: هەندێك نموونەی تر:**

بە راستی، زۆر زۆر ئەستەمە کە لە نووسینێکی ئاوهادا گشت نموونە جیاوازەکانی کاری (گرتن) و هاوتاکانی گەمارۆ بدرێن، چونکە نموونەی هورد و ئاڵۆز زۆرن. بۆ نموونە، هەندێك نموونەی تر دەخەینە روو کە پێویستیان بە تێڕامانە، وەك:

- ❖ نموونەی (خووگرتن بە تشتێکەوە): لە ئێرەدا، کاری ئامرازداری (گرتن بە ... ەوە)، نەك کاری سادەی (گرتن)، واتای بەرکاری ڕێزمانی (خوو)ی هەرسکردوە لە داهێنانی واتایەکی نوێدا.
- ❖ هەردوو واتای (جێگرتن) و (جێگرتنەوە) جیاوازن لە یەکتری، چونکە بەرکاری (جێ) جارێك لە تەك کاری (گرتن) لواوە و جارێك لە تەك کاری دووپاتی (گرتنەوە). ئەم دوو فۆرمەیش جیازازن بە واتا، بە وێنەی هەردوو ناوی بکەر (جێگر: وەکیل) و (جێگرەوە: ئەڵتەرنەتیف).
- ❖ لە کاری (بە گرت دان)دا، کاری (بە ... دان)، وەك: (بە شوو دان) (بە فیرۆ دان) (بە خەسار دان) (بە کوشت دان) (بە پەند دان)، رەگی (گرت)ی هەرس کردوە و واتایەکی لاوەکی داهێناوە.



منتدى إقرأ الثقافي

- ❖ لـە زۆر نموونـەی كـاری (گـرتن)دا، كۆلكـەی بـەركاری هەرسـكراو بـە ئـاڵۆزی دەر دەكەوێت، وەك: (ملـی ڕێ|ی گرتـوە)، (ملـی ڕێـی ڕاسـت|ی گرتـوە)، یـان (ڕێـی ڕاسـتی خۆی|ی گرتوە).
- ❖ زۆرجار هەندێك وشـەی ڕۆنـراو دەبیـنین كـە لـە بنسـتری كـاری (گـرتن) داهێنـراون، وەك: (دەسـتگر، ڕاگـر، ڕێگـر، جێگـر، گرتووخانـە، گرتـە، بگـرە و بـەردە، ماسـیگران، ماسیگرە، ئامێری پێگرە، ئامێری هەلگرۆك، پاشگر، پاشگر، ناوگر، بەرگری و بەرگر، هەوالگری، هۆگر، لاگر...).
- ❖ دیـوی بكـەرنادیاری كـاری (گـرتن) خـوار بومتـەوە بـە دیـوی (گـیران)دا، لـە جیـاتی (گر|ران)، وەك (مانگگیران، خۆرگیران، هەلگیران، ڕاگیران، داگیران، ...).
- ❖ لە پەرەسەندێكی تردا، دەشێت ئاوەڵناوی (گیر) لە (گیربوون و گیركـردن)دا لـە ڕەگـی كاری (گیران)ەوە پەیدا بووبێت و لە پاشتردا وەچەی تری خستبێتەوە، وەك: (جـێگیر و ناجێگیر، گیرا و ناگیرا، ئامێری دارتاشی: گیرە، نووسەكی ڕێزمانی: گیرەك، ...).
- ❖ لە نموونەیەكدا، وەك: (شیلان گوێی گرتوە)، چەند واتایـەك هـەن، بـەلام هـەر واتـای یەكەم زاڵە و سەرمەشقە. چونكە بـەركاری (گوێ) هەرسـكراوە لـە واتایـەكی نوێـدا، وەك:

  (١): گوێگرتن بە هاو-واتای ڕستەی (شیلان گوێی شلكردوە بۆ وێردێك).

  (٢): وەك: (شیلان گوێی ئازادی گرتوە بە دەست).

  (٣): وەك: (شیلان گوێی خۆی قەپاتكردوە بە لەپی دەست).
- ❖ لە نموونەیەكی كورتدا، وەك: (گرتوویەتی)، چەند واتایەك هەن، وەك:

(١): كـاری بنجـی (گـرتن) بـە هـاو-واتـای ڕسـتەی (شـیلان ئـازادی گرتـوە و ناهێڵێـت بڕوات).

(٢): وەك (كەلگرتن) بە نموونەی (مانگاكە كەڵی گرتوە و ئێستا ئاوسـە). لـە ئەوێـدا، دەشیا بگوترابا (كەڵی گرتوە). یان بـۆ داری بـەردار دەشـیا بگوترابـا (بـەری گرتـوە).



منتدى إقرأ الثقافي

بێگومان، وشەكانی (كەڵ، بەر، توخم، ...) بـریتین لـە بـەركاری واتابەست و دەبێت بەرجەستە بكرێن لە زمانی نووسیدا، تا واتا جیاوازەكان تێك نەچرژێن.

ئەمەو گەزاف و هەژموونی واتای (بەركار) زۆر بەر بە فراوانە لە پەرێزی كاری (گرتن)دا. (ئاگر گرتن، ڤێ گرتن، پەركەم گرتن، ژان گـرتن، گـڕ گـرتن، بەرگـە گـرتن، مان گرتن، نەخۆشی گرتن، ...).



منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی هەشتەم

## رووماڵێك بۆ واتادانەوەی كاری دوو پات (گرتنەوە)

**١/٨: دەستپێك:**

وەك لە بەشی پێشوودا باسكرا، لە رێزمانی كاری (گرتن)دا، بزافی واتادانەوە و فرەواتایی زۆر زۆر بەرفراوانە. ئەمەیان لە لایەكەوە، بەڵام لە لایەكی ترەوە، كاری (گرتن) دەبێت بە بنكە بۆ پاشگری دوو پاتی (ەوە) و وەچەیەكی نوێ دەخاتەوە بە فۆرمی چاوگی (گرتنەوە) و رەهای دەكات بۆ ئەوەی وەك گلێنەیەكی واتایی سەربەخۆ بكەوێتە كار. وەك بۆ كاری یەكپاتی (گرتن) ئامازەی بۆ كرا، واتادانەوەی كاری (گرتنەوە)یش هێندە تێك دەچرژێت زۆر زۆر ئەستەم دەبێت كە كێوماڵ بكرێت و ئەمجا نەخشەرێژ بكرێت لە كتێبێكدا، یان لە فەرهەنگۆكێكدا، یان لە بەشێكی كتێبێكدا، وەك ئەم بەشەی بەردەست.

**٢/٨: واتای بنجی لە كاری (گرتنەوە)دا:**

بە بۆ چوونی ئێمە، لە بنجیترین واتای كاری (گرتنەوە)دا چەند سیمایەك هەن، وەك:

(١): بكەر: كەسێكی ژیر و وزەدار.

(٢): بەركار: چەند تشتێكی تێكەڵكراو.

(٣): ئامرازی رووداو: دەست و پەنجەی بكەر.

(٤): ئەنجامی رووداو: بكەری رستەكە وا دەكات كە پێكهاتەكانی (بەركار) بكات بە (گیراوە)یەك.

(٥): پەیامی رووداو: ئەگەر (پەیام) هەبێت، دەشێت (واتای خوازراو)ی لێوە پەیدا ببێت.

(٦): پاشگری دووپاتی (ەوە) واتای فۆرمە تازەكە دەترازێنێت لە واتای كاری (گرتن).

لە راستیدا، پاشگری (ەوە)، لە كاری (گرتن)دا، جۆرێك لە واتا دەداتەوە، وەك: (ئامادەكردنی گیراوەیەك). بەنموونەی: (ئازاد چەمەنتۆ دەگرێتەوە). لە ئەم واتایەدا،



منتدى إقرأ الثقافي

کاری یـەکپاتی (گرتنـەوە) پەیـدا بـوە، چـونکە پاشـگری (ەوە) واتـای کـاری (گـرتن)ی بـە تـەواوی گۆڕیـوە بـۆ واتـای (هەڵشـێلانی تشـتی و تونـد و شـل پێکـەوە بـۆ دروسـتکردنی گیراوەیەك لە چەشنی: قوڕ، لیتە، گەچاو، هەویر، چەمەنتۆ، ... ). بـە راسـتی، ئـەم واتایـە زۆر لـە بنجی دەچێت، چونکە وشـەی (گـیراوە)ی لێـوە داڕێـژراوە. واتـە، بکـەری رسـتەکە (ئازاد) بەرەبەرە مادە توندەکە (لم + چەو + تۆزی چەمەنتۆ) دەگرێـت و دەی دات بـە دەم مادە شلەکەوە (ئاو) تا گیراوەیەك دروست بکات.

سەبارەت بە واتای دوو بارە گرتنەوەی بەرکار، وەك: (لە راکردندا، شـیلان ئـازادی گرتەوە)، کاری (دووبارە گرتنەوە) واتاکەی گەیشتوە بە بواری (وەرزش)، چونکە لە یەکەم جاردا (گرتن بە دەست) هەبوە و لە دواتـردا واتـای (گرتنـەوە) فـراوان بوەتـەوە و کـرداری (گرتن بە دەست) فەرامۆشکراوە، چونکە گەیشـتوە بـە چـەند بـوارێکی تـر کـە (وەرزش)ی تێدا نیە، بەڵام کێبڕکێ و پێشبڕکێی تێدا هەیە، وەك بواری خوێندن و کار وبـاری نووسـین و بلاوکردنەوە.

### ۳/۸: واتاگۆڕین بە روخسارگۆڕین:

وەك لە باری یەکپاتی (گرتن)دا باسکرا، هەر مۆرفیمێکی واتاگۆڕ کە دەچێتە سەر کارێـك هـەم واتاکـەی دەگۆڕێـت و هـەم روخسـارەکەی، یـان واتایـەکی بنجـی دوەم بنیـاد دەنرێت لە سـەر بناغـەی واتـا بنجیەکەی یەکەم. بـۆ نموونـە، پێشـگرەکانی (هـەڵ، دا، را) بۆیان هەیە ببن  بە (رۆخسارگۆڕ و واتاگۆڕ) بۆ کاری (گرتن)، وەك (هەڵ گـرتن، دا گـرتن، را گـرتن). سـەرەڕای ئـەوە، کاتێـك کـە ئـەو روخسـارە گۆڕاوانـە پاشـگری دووپـاتی (ەوە) وەردەگرن بۆیان هەیە تا چوار واتای بنجی پڕ بکەنەوە. بۆ نموونە، کـاری (دان) دەتوانێـت چـوار واتـای بنجـی پـڕ بکاتـەوە، نەخشـەی (۱/۸). بـە هـەمان شـێواز کـاری (گـرتن)یش دەتوانێت چوار واتای بنجی ریزبکات بۆ چوار روخساری نەخشەی (۲/۸).



منتدى إقرأ الثقافي

| کار | نموونە |
| --- | --- |
| دان | من پارەکەم داوە |
| دانەوە | ئەم کراسە ڕەنگ دەداتەوە |
| هەڵ + دان | من تۆپەکەم هەڵ داوە |
| هەڵ + دان + ەوە | من پەردەکەم هەڵ دایەوە |

نەخشەی (١/٨): چوار واتای بنجی بۆ چوار جۆری کاری (دان).

| کار | نموونە |
| --- | --- |
| (١): گرتن | من تۆم گرت (بە دەست) |
| (): گرتنەوە | من تۆم گرتەوە (لە ڕاکردندا) |
| (٣): دا + گرتن | من تۆم داگرت (لە سەربانەکە) |
| (٣): دا + گرتن + ەوە | من تۆم داگرتەتەوە (بە گلەیی) |

نەخشەی (٢/٨): چوار واتای بنجی بۆ چوار جۆر لە کاری (گرتن).

**٤/٨: کاری دووبارە (هەڵ گرتنەوە):**

کاری (گرتن) دەتوانێت پێشگری واتاگۆڕ (هەڵ) و پاشگری (ەوە) پێکەوە وەر بگرێت و واتایەکی بنجی تازەی لێ پەیدا ببێت، وەك:

(١): شیلان میروەکانی هەڵ گرتەوە

(٢): شیلان کراسەکەی هەڵ گرتەوە

(٣): شیلان منداڵەکەی هەڵ گرتەوە

لە ڕستەی (١)دا، واتای (دووبارە هەلگرتن) چەسپاوە، چونکە بە هۆیەك لە هۆیەکان (میروەکان) ڕژاونەتە سەر ڕووبەرێك و لە پاشتردا (شیلان) میروەکانی هەڵ گرتوەتەوە. بە کورتی، یەکەم جار کاری (ڕژان) چەسپاوە و دوەم جار کاری (هەڵ



منتدى إقرأ الثقافي

گرتنەوە) چەسپاوە. لە نموونەی (٢)دا. هـەمان واتـای پێشـوو دەچەسـپێت، چـونكە یەكـەم جار كاری (كراس فرۆشـتن) چەسـپاوە و دوەم جـار كـاری (كـراس كڕینـەوە) چەسـپاوە. لـە ڕستەی (١)دا، كاری (میروو هەڵ گرتنەوە) واتای كـاری (مـیروو چـنینەوە) دەداتـەوە، بـەلاّم لە ڕستەی (٢)دا، كاری (كراس هەڵ گرتنەوە) واتای كاری (كـراس كڕینـەوە) دەداتـەوە. بـە هەمان شێوە لە نموونـەی سێیەمدا بە هۆیەك لە هۆیەكان (منداڵێك) بێ خاوەن ماوەتـەوە، بەلاّم بكـەری ڕسـتەكە (شـیلان) بـوە بـە خێوكـەری و وەك دایـك هـەڵی گرتوەتـەوە. واتـە، یەكەم جار منداڵەكە لە لایەن دایـك و باوكیـەوە فـڕێ دراوە و دوەم جـار (شـیلان) ئـەركی پیرۆزی دایكی چەسپاندوە. بە ڕاستی، واتای كاری بنجی (هەڵ گـرتن) زاڵ دەبێـت بـە سـەر هـەر سـێ بـەركارەدا (مـیروو، كـراس، منـداڵ)، چـونكە بكـەری ڕسـتەكە (شـیلان) بـە (یەكپاتی) هەڵیان دەگرێت و دەیان بات بۆ لای خۆی، بەلاّم ئەم واتا یەكپاتەی كاری (هـەڵ گـرتن) لـە هـەنگاوی سـفرەوە دەسـت پـێ ناكـات، لـە بـەر ئـەوەی دەبێـت بـە تەواوكـەر بـۆ ڕووداوی سێ كـاری تـر، وەك (ڕژان، فرۆشـتن، فـڕێ دان). كەواتـە، لـە ئـەو سـێ ڕسـتەیەدا، یەك واتای بنجی هەیە بۆ كاری (هەڵگرتنەوە)، بەلاّم (واتا)ی سێ بەركاری جیاواز (مـیروو، كراس، منداڵ) سێ واتای جیاوازی داهێناوە. چـونكە كۆلكـەی (بـەركار) پشـكێكی هەیـە لـە واتابەستندا.

**٥/٨: واتا گۆڕاوەكانی كاری (گرتنەوە):**

لـە هەنـدێك نموونـەی كـاری (گرتنـەوە)دا، پێشـگرە واتاگۆڕەكـان ڕۆڵ دەبینـن و واتای تازە دا دەهێنن، وەك:

**(١): كاری (داگرتنەوە):**

وەك لە سەر نەخشـەی (٢/٨) باسـكرا، كـاری (گـرتن) دەتوانێـت پێشـگری واتـاگۆڕ (دا) و پاشـگری (ەوە) پێكـەوە وەر بگرێـت و واتایـەكی بنجـی تـازەی لـێ پەیـدا ببێـت (داباراندنی بێزاری بە سەر كەسێكدا)، وەك: (شـیلان ئـازادی دا گرتـەوە بـە ڕەخنـە و بـە گازنـدە).



منتدى إقرأ الثقافي

**(٢): کاری (راگرتنەوە):**

کـاری (گـرتن) دەتوانێـت پێشـگری واتـاگۆڕ (را) و پاشـگری (ەوە) پێکـەوە وەر بگرێت و واتایەکی بنجی تازەی لـێ پەیـدا ببێـت (وەسـتاندنی یـەکجارەکی)، وەك: (شـیلان تۆپەکەی راگرتـەوە).

**(٣): کاری (وەرگرتنەوە):**

کـاری (گـرتن) دەتوانێـت پێشـگری واتـاگۆڕ (وەر) و پاشـگری (ەوە) پێکـەوە وەر بگرێت و واتایەکی بنجی دووپاتی لێ پەیدا ببێت (دوو بارە وەرگرتنەوە). وەك: (دووبـارە، شیلان پارەکەی وەرگرتـەوە).

**٦/٨: واتای خوازراو:**

بە سەربارکردنی پاشگری (ەوە)، کاری (گرتن) واتایەکی بنجی تـازە پەیـدا دەکـات بۆ دووپاتی. لە پاشتردا، بەرکاری واتابەست (قوڕ) وەردەگرێت واتایەکی بنجی نـوێ پەیـدا دەکات وەك (هەڵ شیلانی گڵ و ئاو پێکەوە بۆ ئامـادەکردنی گـیراوەی قـوڕ و لیتـاو). واتـە، تێکەڵکردنی چشتی توند و شل بۆ دروست کردنی گیراوەیەك لە چەشنی (قوڕەلیتە)، وەك: (ئازاد قوڕ دەگرێتەوە). لە ئەم رستەیەدا سیماکانی واتاسازی، بە ئەم چەشنە:

- بکەر، زیندوو و ژیر و وزەدار.
- بەرکار، گیراوەی ئاو و خۆڵ.
- دەستەبەرە، بە دەست، یان، بە ئامرازێك.
- ئەنجام، ئاو و خۆڵ گیراوەیەك پێك دەهێنن (قوڕ).
- **پەیام: بۆ ئەوەی لە پرسەدا بی دەن لە سەر، یا بی کەن بە (قوڕپێوان).**

لە ئەو ئاکارانەدا، ئەگەر سیماکانی یەك تا چوار بخەینە کار، ئـەوا واتـای بـنجی و فراوانی (قوڕکاری) دەچەسپێت. بەڵام ئەگەر (پەیام) بکەین بە سیما بۆ (قوڕ لە سەردان)، ئەوا واتای بنجی (قوڕ گرتنەوە) لاردەبێتەوە بەلای (کۆست کەوتن)دا. لە ئـەم بانێژەیـەوە،



منتدى إقرأ الثقافي

جاران، كە كۆست دەكەوت، یان كە كەسێك دەمـرد، خـەڵكی قوڕیـان دەدا لـە سـەر خۆیـان، وەك: هێمایەك بۆ (كۆستكەوتن). هەر لەبەر ئەوە، ئەم واتاسەربارە پەیدا بـوە و چـەندین واتـای خـوازراوی دیكـەی لـێ كەوتوەتـەوە، وەك (قـوڕ بەسـەر، قـوڕ بەسـەری، قـوڕ پێـوان، قۆڕگرتنەوە...). لە پاشتردا، هەر چوار سیماكەی سەرەتا فرێدراون و سیمای پێنجەم كراوە بە (پەیام) و واتای (كۆستكەوتن) زاڵ بوە بە سەریدا. ئەمجا، ئەم واتایە كـراوە بـە جـوێنی سپی وەك: (هەی قوڕ بەسەر، قوڕت بەسەر، قـوڕ بگـرەوە و تێـی بنیشـە،، قـوڕ بـە سـەران، دەك قوڕ بە سەر بیت). لە گەڵ ئەوەیشدا، ئیـدیۆمی (قـوڕ گرتنـەوە) واتـای پێشـوازیكردن لە (كۆست) دەبەخشێت. بەڵام واتای (قوڕ پێوان) واتـای شـیوەنی (كۆسـتكەوتن) دەداتـەوە، نەخشەی (٣/٨).

| | | |
|---|---|---|
| | | گرتنەوە |
| | | ↓ |
| قوڕ گرتنەوە (واتای خوازراو) | ← | قوڕ گرتنەوە (واتای بنجی) |

نـەخشەی (٨ : ٣): سـەجـەرەی ئیـدیـۆمـی (قـوڕگـرتنـەوە)

لە لایەكی تـرەوە، كاتێـك كـە كـاری (گرتنـەوە) واتابەسـتی (بـەركار) وەردەگرێـت، چـەند واتایـەك دەداتـەوە، وەك: (فـاڵ گرتنـەوە، بـەخت گرتنـەوە، دەسـت گرتنـەوە، قـاوە گرتنەوە). لە ڕاستیدا، سەرچاوەی ئـەم بەكارهێنانـە تـەم و مـژدار و تاریكـە، چـونكە زۆر دوورە لـە واتـای كـاری (گـرتن)ەوە. لـە گـەڵ ئەوەیشـدا، كـاری (قـاوە گرتنـەوە)، نـەختێك ڕێگاكـە ڕوونـتر دەكاتـەوە، چـونكە گیراوەیـەك بـە ڕووداوی پتـەوی (گرتنـەوە، تێـك هـەڵ شێلان) ئامـادە دەكرێـت، بـۆ ئـەوەی لێـك بدرێتـەوە، یـان بخوێنرێتـەوە. پاشـان، ڕەنگـە لـە (دەسـت گرتنـەوە)دا، هێڵـەكانی (ناولـەپ) شـوبهێنرابێت بـە لۆچـە پێچاوپێچـەكانی ئـەو



منتدى إقرأ الثقافي

گیراوەیە. یان، (بەخت گرتنەوە) بریتی بێت لە (دەست گرتنـەوە)، لەگەڵ ئەوەیشدا، تـۆ بڵێیت لە ئەو جۆرە واتایانەدا گیراوەیەك بە كار نەهێنرابووبێت.

**٧/٨: كاری گرتنەوەی رووبەرێك:**

كاری (گرتن) كاتێك كە پاشگری (ەوە) واتایـەكی بنجـی تـازە پەیـدا دەكـات، وەك: (گرتنـەوە) بـە واتـای (هـەڵ شـێلانی گـل و ئـاو) لـە (قوڕگرتنـەوە)دا. لـە ئـەم واتایـەدا سیماكانی واتاسازی، بە ئەم چەشنە:

(١): بكەر، زیندوو و ژیر و وزەدار.

(٢): بەركار، گیراوەی ئاو و خۆڵ.

(٣): دەستەبەرە، بە دەست، یان بە ئامرازێك.

(٤): ئەنجام، ئاوەكە هەموو دەنكۆڵەكانی گڵەكە تەڕ دەكـات، تـا گیراوەیـەكی تـەواو پێك دەهێنێت.

لە ئەم جۆرە واتایەدا، زوومی واتای خوازراو دانەویوەتە سەر خانَی (٤)، وەك:

(١): ئەم بارانە هەموو وڵات دەگرێتەوە.

(٢): ئەم هەواڵە خۆشە هەموو میللەت دەگرێتەوە.

(٣): ئەم مووچەیە گشت كرێكارەكان دەگرێتەوە.

لە راستیدا، واتای خوازراوی (گرتنەوە) فراوان بوەتەوە بۆ چەندین بواری واتایی. واتـە، كـاری دووپـاتی (گرتنـەوە) واتایـەكی تـازەی پەیـداكردوە، بـەڵام دەشـێت لـە واتـای یەكەمەوە خوازرابێت. چونكە لـە هـەر گیراوەیەكـدا، مـادە شـلەكە بەرەبـەرە هـەموو مـادە توندەكە دەگرێتەوە، یان مادە توندەكە بەرەبەرە دەخرێتە بەر مادە شلەكە بۆ ئـەوەی بـی كات بە گیراوەیەك. بە ئەم پێیە، دەشێت لـە (ئـەنجام)ی كـاری (گرتنـەوەی گیراوەیـەك)ەوە ئەم واتا خوازراوەی كاری (گرتنەوە) پەیدا بووبێت.



منتدى إقرأ الثقافي

**٨/٨: كاری جومكە گرتنەوە:**

زۆر جـار مـرۆڤ لـە كـەوتن و بەركەوتنـدا، یـان لـە ڕووداودا، ئەنـدامی لەشـی دەشكێت، یان جومگەی لەجێ دەچێت، وەك: (شیلان كەوت و دەستی لە جێ چوو). لە ئەم نموونەیەدا، دەبا بگوترابا: (شـیلان كـەوت و جومگـەی دەسـتی لـە جـێ چـوو)، یـان ئـەگەر بمانەوێت جوانتر دیاری بدەین، دەتوانین بڵێین: (شـیلان كـەوت و جومگـەی مەچـەكی لـە جـێ چـوو). واتـە، جەمسـەری دوو ئێسـكی جومگـەی لـەش، كـە بـە (چـەرخ و چـەمەر) ناسـراون لـە كوردەواریـدا، لـە بـاری ئاسـایی خۆیـان دەتـرازێن، چـونكە سـەری ئێسـكە ناوەكیەكـە (چـەرخ) لـە بۆشـایی چـەمەری ئێسـكە دەرەكیەكـە دەردەچـێت و دەبێـت بگەڕێنرێتەوە جێی ئاسایی خۆی. لە ئێرەدا، ئەمـە مەبەسـتی ئێمـە نیـە. مەبەسـتی ئێمـە بریتیە لە (گرتنەوە مەچـەكی دەسـتی شـیلان)، وەك دەگوترێـت: (مـام جوامێر جومگـەی مەچەكی شیلانی گرتـەوە). كەواتـە، كـاری (گرتنـەوە) بـە پێچـەوانەی كـاری (بـەربوون و دەرچـوون لـە ریـز) بـە كـار هێنـراوە و دەبێـت بـزانین چۆنچـۆنی كـاری (گـرتن) پـەرەی سەندوە و بوە بە (جومگە گرتنەوە):

**یەكەم**: واتای بنجی كاری (گـرتن) بـە ڕووداوی پتـەوەوە، بـە میكـانیزمی (فرەڕوخسـاری) پاشگری دووپاتی (ەوە)ی وەرگرتوە و بوە بە (گرتنەوە)، وەك لەسەر نەخشەی (٤/٨):




نەخشەی (٤/٨): كاری (جومگەگرتنەوە)



منتدى إقرأ الثقافي

**دوەم**: لـە ئاسـتی نموونەکـەی ئێمـەدا (جومگـە گرتنـەوە)، واتـای (دووبـارە گرتنـەوە) چەسپاوە: (شیلان چۆلەکەکەی گرت)، بەڵام ئەگەر (چۆلەکەکە) لە قەفەز دەرچوو و بوو بە (ڕەها و بەرەڵا) و ئەمجار( شیلان) گرتیەوە بە دەست، ئەوسا کاری (گرتنەوە) واتایەکی نوێ پەیدا دەکات بۆ دژ واتایی (دەرچوون لە ژێر ڕکیفی بکەر).

**سێیەم**: بە تەریبی لە گەڵ ئەوەدا، لە ڕاکردندا ئەگەر کەسی یەکەم ڕا بکات و دەربچێت لە ڕیزەکە و کەسی دوەم لە پاشتردا ڕا بکات و بگاتەوە پێی (گەیشتن بە کەسی یەکەم)، ئەوا واتا (گرتنەوە) دەچەسپێت. ئەم واتایە، لە ڕەسەندا (خوازراو) نەبوە، چونکە کەسی دوەم بە دەست پشتی یەکەم دەگرێت، بۆ هێمای (بردنەوە). لە یاری ڕۆژانـی ئێستادا، گەمـەکان ڕێسایان هەیە و ئەگەر واتای (گرتنەوە) بچەسپێت، ئەوا بە (خوازراوی) بەکار دەهێنرێت.

**چوارەم**: وەك چۆن لە ڕاکردندا، یەکێك لە ڕیز دەردەچێت (خاڵی پێشوو)، یان، وەك چۆن چۆلەکە لە دەست دەرچێت (خاڵی پێشتر)، هەر ئاوهایش ئێسکەکانی جومگە لە یەکتری دەردەچن و لە یەکتری دەترازێن. بە هەمان شێواز، وەك ناچار کردنی چۆلەکەی بەرەڵابوو و ڕاکردووی ڕیز بەزاندوو بۆ هاتنەوە ڕیز، هەر ئاوها ئێسکی جومگە بەزاندوو، ناچار دەکرێت کە بگەڕێتەوە شوێنی ڕەسەنی خۆی. لە ئەم کارەیشدا، ڕووداوی پتەوی کاری (گـرتن) دەچەسـپێت، چـونکە بەیتاڵەکـە زینـدوە و ژیـرە و وزەدارە و دەسـت بـەکار دەهێنرێت بۆ ئەوەی جەمسەری ئێسکە لە جێچوەکە بخاتەوە نێو چەمەری ڕەسەنی خۆی.



منتدى إقرأ الثقافي

# بەشی نۆیەم

## بەرەنجام و پوختەکاری

- ڕووداوی هەر چاوگێکی بنجی واتایەکی بەرجەستە و ڤیدیۆیی هەیە. ئەو واتا بنجیە چەند سیمایەکی واتاسازیانەی ڕاست و ڕەبەق هەڵ دەگرێت، کە پێویستە بە دانسقەیی شرۆڤەکاری بۆ بکرێت. بۆ نموونە، دەشێت ڕووداوی کاری (خواردن) بکرێت بە شریتێکی ڤیدیۆیی و گشت کۆلکە پێکهێنەرەکانی نمایش بکرێت. تەنانەت، دەبێت قەبارەی (تیکە) و قەبارەی (دەم)یش بەراورد بکرێن، چونکە لە نموونەیەکدا وەك: (ئەو دەرگایە ئەم مێزە ناخوات)، ئەو بەراوردە شوبهێنراوە بە قەبارەی دەم و تیکە.
- لە هەنگاوی سالگاردا و لە گێژەنی بەکارهێناندا، هەر وتایەکی بنجی دەکەوێتە بەر بزاڤی میکانیزمەکانی (واتادنەوە). لە ئەم دیاردەیەدا، هەندێك لە سیما پێکهێنەرەکانی واتا بنجیەکە دەگۆڕێن بە هی تر، بەڵام ڕووداوی کارەکە، بە جۆرێکی لە جۆرەکان، هەر دەمێنێتەوە.
- واتای خوازراو لە سەر (ئەنجامی ڕووداو) و (پەیامی ڕووداو) ڕۆدەنرێت، نەك لە سیماکانی واتای بنجی. کەواتە، پێویستە ئەم دوو سیمایەیش ڕەچاو بکرێت لە گەڵ سیما بنەڕەتیەکانی واتای بنجیدا. لە ئەم ڕوەوە، (ئەنجامی ڕووداو)، لە کاری (گرتنی تشتێك)دا، بکەری ڕستەکە (بەرکار) چەسپ دەکات بە خۆیەوە. بەڵام (پەیامی ڕووداو)، لە کاری (دەست گرتنی نابینایەك)دا پەیامێکی مرۆیی پیرۆز هەیە بۆ باربوویی و دەستگیرۆیی کەسانی دووچار بە کێشەیەکەوە.
- هەر واتایەکی خوازراو کە لە سەر (وێکچوون و شوبهاندن) ڕۆنرابێت، نەك لە سەر سیماکانی واتای بنجی، دەشێت زاراوەڕێژ بکرێت بە (خوازە)، وەك کاری (دڵ شکان، دڵ شکاندن، دڵ شکێنران). لە بەرانبەردا، هەر واتای خوازراو کە دوو واتای هەبێت، یەکەمیان (واتای بنجی و ڕوون)، وەك (دەست گرتنی منداڵ)، بەڵام دوەمیان (نابنجی



منتدى إقرأ الثقافي

و ناڕوون)، وەك (دەست گرتنی هەژارێك بە پارە: باربووییکردن). ئەم جۆرە واتایەی دوایی دەشێت زاراوەڕێژ بکرێت بە (ئیدیۆم).

- لادان لە واتای بنجی، بە مۆرفیمی (واتا گۆڕ)، بریتیە لە گواستنەوەی ئەو واتا بنجیە بۆ واتایەکی بنجی نوێ لە ڕوخسارێکی دەنگی نوێدا. بێگومان، ئەو ڕوخسارە تازەیە واتای بنجی خۆی هەیە و ئەو واتا تازەیە بۆی هەیە بکەوێتە بەر بزافی (فرەواتایی). بۆ نموونە، هەردوو کاری (گرتن و هەڵ گرتن) دوو واتای بنجی سەربەخۆیان هەیە.
- بە شێوازێکی جودا لە زمانانی دی، لە زمانی کوردیدا (بەرکار)ی ڕێزمانی، لە گشت نموونەیەکدا، بریتیە لە (واتابەست)ێکی چوست و چەلەنگ. بە پێی (بنەمای ئاوێنە)، ئەو بەرکارە دەچێتە سەر هەر ناوێکی ڕۆنراو، وەك: (ناو نووسین، ناو نووس، ناو نووسیو، ناو نووسراو، ...). بە پوختی، لە زمانی کوردیدا بە گشتی، کۆلکەی (بەرکار) خانەی خۆی هەیە لە قەوارەی (کار)دا. لە سەرپاکی ئیشەکانی ئێمەدا ئەو خانەیە بە خانەی (+٥) ناسراوە.
- وەك پەراوێزێك بۆ خاڵی پێشوو، لە ئاستی هەندێك (بەرکار)دا، هەندێك لە کارەکان بۆیان هەیە ببن بە کاری یاریدەری واتایی، وەك: (سوێند خواردن). لە ئەم ڕوانگەیەوە، چاوگی (سێو خواردن) ناچێتە نێو فەرهەنگەوە، چونکە واتاکەی نەگۆڕاوە و بەرکاری (سێو) دەشێت هەر ناوێکی بەجێ بێت. وەلێ، چاوگی (سوێند خواردن) دەچێتە فەرهەنگەوە، چونکە بەرکاری (سوێند) واتاکەی گۆڕیوە و واتایەکی تازەی داهێناوە.
- لە ئەو جۆرە کارە داهێنراوەدا تەوەری (واتاسازی) لە سەر واتای کۆلکەی بەرکار (سوێند) دەگەڕێت. بەڵام تەوەری (ڕستەسازی) لە کاری (خواردن)ەوە دەخوازرێت. بە هەمان شێواز، لە کاری (درز بردن)دا واتای بەرکاری (درز) تەوەری (واتاسازی) دابەستوە، بەڵام کاری (بردن) تەوەری (ڕستەسازی) بۆ خستوەتە گەڕ. بە ڕاستی، ئەم سیما ڕەسەنە زمانەکەمان جودا دەکاتەوە لە خێزانەزماکانی تر، بە تایبەتی لە زمانەکانی (عەرەبی، ئنگلیزی، فەرەنسی).



منتدى إقرأ الثقافي

- مەرج نیە (واتای خوازراو) هەر لە (واتای بنجی)یەوە پەیدا ببێت و دەشێت لە هەر واتایەكەوە پەیدا، كە لە پێشتردا بە میكازمەكانی تر داهێنرابێت. بە كورتی، مەرجی واتای خوازراو لە نەوەدایە كە (ئەنجامی ڕووداو) و (پەیامی ڕووداو)ی هەرسكردبێت لە داهێنانی واتا تازەكەدا.
- واتای بنجی هەر كارێك بریتیە لە (كۆنترین) و (لەپێشترین) واتا لە ڕیزی ئەو واتایانەدا، كە لە فەرهەنگی هەر كارێكدا ڕیز دەبن. بە واتایەكی دی، واتای بنجی ئەو تیشكۆیەیە كە هەموو سیماكانی واتاسازی لە ڕووداوی كارەكەدا دەچەسپێن.
- لە چیكەنەی زماندا، شەپۆلی (فرەواتایی) و (واتا گۆڕی) و (واتاخوازی) هەموو كاتێك لە پەرەسەندندایە. ئەم بزاڤە، زمان پێش دەخات و هەر كاتێك بوەستێت زمانەكە سست دەبێت، یان دەشێت بەرەو نەمان بچێت.
- لە زمانەكەی ئێمەدا، بە بەراورد لەگەڵ زمانی دیدا، ئەگەر ژمارەی كارەكان كەمتر بێت، بەڵام ژمارەی واتاكان هەر دەبێت یەكسان بێت. ئەمەیش خۆی لەخۆیدا بزاڤی پێشكەوتن پەیدا دەكات و چالاكی (واتاسازی) بەپێزتر دەكات و ڕێژەی واتای خوازراو (خوازە و ئیدیۆم) بەرزدەكاتەوە، چونكە زمانەكەی ئێمە ژمارەی كارە بنجیەكانی كەمترە.
- وا پێ دەچێت، كە زمانی كوردی زۆرتر بە بزاڤی واتادانەوە و واتاخوازی پەرە بستێنێت، یان وا پێ دەچێت كە زمانەكەمان زۆر حەزی لە واتای خوازراو بێت[٢٧]. بۆ نموونە، ئیدیۆمی (دان پێدا نان) بوە بە وشەیەك و جێی خۆی گرتوە لە فەرهەنگدا.
- واتای خوازراو بریتیە لە ئاستێكی بەرزتر لە زماپاراوی و ڕەوانبێژیدا. ئەم ئاستە بەرزە لە سەر ئاستی بنەڕەت (واتای بنجی) ڕۆنراوە. كەواتە، هەر كەسێك كە (زمانی دوەم) فێر ببێت، لە یەكەم هەنگاودا ئاستی یەكەم هەرس دەكات، بەڵام ئاستی دوەم (واتای خوازراو) لە هەنگاوی دوەمدا دەچەسپێت. ئەم هەنگاوەیش ڕەنگە هەر

[٢٧] مامۆستای خوالێخۆشبوو (پرۆفیسۆر محەمەد مەعرووف) دەی گوت: بە بەراورد لە گەڵ زمانانی تر، براڤی (ئیدیۆم) لە زمانی كوردیدا زاڵترە و بەبرەوترە.



منتدى إقرأ الثقافي

پێویست نـەبێت بـۆ ئـاخێوەرانی زمـانی دووەم. بـە بـەراوردا بـە ئـەو زمانانـەی کـە ئیـدیۆمیان کـەمترە، دەشـێت زمانــە ئیدیۆمیــەکان پلەیــەك جیرتـر و گـرانتربن لــە فێربووندا، بە تایبەتی بۆ گەوران.

- هەندێك لە کاری زمـانی کوردی، دیـوێکی یاریـدەدەریان هەیـە بـۆ هەرسـکردنی واتـای کۆلکـەی (بـەرکاری ڕێزمـانی)، وەك (مـانگرتن، هەناسـەدان، درزبـردن، ...). لـە ئـەم جۆرەکارەدا لابردنی (کۆلکەی بەرکار)، وەك (مان، هەناسـە، درز، ...)، دەبێـت بـە هـۆی پووکانەوەی واتا تازەکە.
- بە پێی خاڵی پێشوو، لە ڕووی ڕێزمانـەوە، وشـەکانی (مـان، هەناسە، درز، ...) بـریتین لە (کۆلکەی بەرکار)، کەچی لە ڕووی واتاسازیەوە ئەو وشانە، بە جۆرێك لە جۆرەکـان، بریتیە (کۆلکەی واتاگۆڕ). ئەم ڕاستیە پردە باریکەکانی نێوان هەردوو ئاستی (ڕێزمـان و واتاسازی) بە شێوەیەکی جوانتر دەر دەخات.
- پاشـگری دووپاتکردنــەوە (ەوە) دەچـێتە سـەر هـەموو چـاوگێك، چـی بنجـی، چـی دارێژراو، چی لێکدراو. لە پاشتردا، دەچێتە سەر هەر ڕێژەیەك، یان هەر ناوێـك کـە لـە ئەو چاوگانەوە وەرگیرابێت.
- پاشگری دووپاتکردنەوە (ەوە)، بە سێ ڕێچـکەی پانـدا ڕوو دەکـات لـە بزافـی واتـاسازی، وەك:

**یەکەم**: دووبارەبوونەوە و واژکردنەوەی ڕووداوی کارەکە.

**دووەم**: تەسککردنەوەی واتای کارەکە بە شێوازی ڕوودانەکەی.

**سێیەم**: ژیاندنەوەی واتای ڕووداوی کارێکی (بێ واتا).

- لە ڕێچکەی (یەکەم)دا سێ ڕاڕەو هەن بۆ واتاگۆڕکی:

(١): دووباره بوونەوە بە وچان، وەك: (نوستن: نوستنەوە).

(٢): دژواتایی دژئاراستە. وەك: (ڕۆیشتن: هاتنەوە).

(٣): دژواتایی هاوئاراستە، وەك: (هاتن: هاتنەوە).

- لە ڕێچکەی دووەمدا، دوو ڕاڕەوی تایبەتی هەیە بۆ واتاگۆڕین، وەك:



منتدى إقرأ الثقافي

(١): واتای ئەنجامدان تا دوا تنۆك، وەك (بڕین: بڕینەوە).

(٢): واتای بڵاوبوونەوە و بەردەوامی، وەك (بزووتن: بزووتنەوە).

- لە ڕێچكەی سێیەمدا، واتـاگۆڕكێ بـەرپا نابێـت، بـەس بـە پاشـگری (ەوە) واتـای سسـتی كارێك زیندوو دەبێتەوە، وەك (كووژان*: كووژانەوە).
- لە ڕێچكەی یەكەمدا، بە هیچ جۆرێك واتای بەرین و فراوانی كارەكە تەسك نابێتـەوە. بە پێچەوانەوە، لە ڕێچكەی دووەمدا واتای بەرین و فراوانی كارەكە تەسك دەبێتەوە بـە سەر واتایەكی تایبەتیدا. بەڵام، لە ڕێچكەی سێیەمدا واتای كارێـك دەردەكەوێتـەوە كـە بە بێ پاشگری (ەوە) واتای نیە.
- لە شێوەزاری شاری سلێمانیدا، پاشـكۆی (ـەوانێ) دەخرێتـە سـەر كلكـی كارەكـە، وەك: (هاتـ|ـەوانێ)، یـان، بەزێدەڕۆییـەوە، دەشـێت بخرێتـە سـەر كلكـی كـارە دووپاتەكـە، (هاتـەوە : هاتـ|ـەوە|وانـێ). بـە بۆچـوونی ئێمـە، پاشـكۆی (ـەوانێ) سـەربەخۆیە لـە پاشگری (ەوە). بە ڕاستی، گشت كاتێك ئەركی پاشـگری (ەوە) ئەوەیـە كـە، بـە جۆرێـك لە جۆرەكان، واتای ڕووداوی كار بگۆڕێت. بەڵام ئەركی پاشگری (ـەوانێ) تـەنها و تـەنها ئەوەیە واتای **دووبارە بوونەوەی ڕووداوی كارەكە** زاڵ بكات. كەواتە، لە جیـاتی ئـەوەی ئەم مۆرفیمە بەرەو (نغرۆبوون) بڕوات، چونكە ناگـات بـە (زمـانی نووسـین)، دەشـێت ڕۆژێـك لـە ڕۆژان كـەڵكی لـێ وەبگیرێـت بـۆ جوداكردنـەوە دوو ئـەركی واتـایی كـە هەردووكیان كەوتوونەتە ئەستۆی پاشگری (ەوە)، بەڵام بە تێكەڵ و پێكـەڵی. ئـەو دوو ئەركـەیش بەنـەم شـێوازە دابـەش دەبـن، (١): مـۆرفیمی (ەوە) بـۆ واتـاگۆڕكێ، (٢): مۆرفیمی (ەوانێ) واتای دووپاتی. یان هەردووك پێكەوە، بۆ واتاگۆڕكێ و بۆ دووپاتی.
- لـە كـاری (گـرتن)دا، پاشـگری (ەوە) واتایـەك دابـین دەكـات لـە چەشـنی: ئامـادەكردنی (گیراوە)یەك، یان دوو بارە خستنەوە ڕیزی لایەنێكی ترازاو لە ڕیزی خۆی.
- لە هەندێك كاردا، كاتێك كە دوو مۆرفیمی واتاگۆڕ كاریگەری واتـاگۆڕكێ دەخەنـە ڕوو، واتای (چوارەم) پەیـدا دەكەن. چونـكە واتای یەكەم (گرتن) جیاوازە هەم لە واتـای دووەم



منتدى إقرأ الثقافي

(گرتنـەوە) و هـەم لـە واتـای سێیەم (داگـرتن)، ئـەمجایش واتـای چـوارەم (داگرتنـەوە) جیاوازە لە ئەو واتایانەی تر.

- كاری (هەڵ گرتنەوە) دەتوانێت پێشگری واتاگۆڕ (هەڵ) و پاشـگری (ەوە) پێكـەوە وەر بگرێـت و واتایـەكی بنجـی تـازەی لـێ پەیـدا ببێـت، لـە چەشـنی (دووبـارە هـەڵگرتن)، بەمەرجێك كە ببێت بە (دژواتا)ی ڕووداوێكی كاری تـر كـە لـە پێشـتردا بـەرپابووبێت، وەك نموونەی (فڕێ دانی منـداڵ)، كـە دژواتاكـەی بریتیـە لـە كـاری (هـەڵ گرتنـەوەی منداڵ).
- لە سەر پەیام و مەبەستی كاری (گرتنەوەی گیراوەیەك)، دەشێت بـە كۆڵكـەی بـەركاری ڕێزمانیەوە، وەك (قوڕ گرتنەوە)، **واتای ئیدیۆم پەیدا بكرێت.**
- لە سەر خواستنی ئەنجام و پـەیامی كـاری (گرتنـەوەی گیراوەیـەك)، دەشـێت دەسـەڵاتی (بكـەری ڕێزمـانی) هـەموو ڕووبـەری (بـەركار) بگرێتـەوە، وەك (ئـەم سوپاسـنامەیە نێوەیش دەگرێتەوە).
- ئەو كارە لێكدراوەی كە بەكۆڵكەی (بەركار) جێ دەبێت لەچەشنی (تێپـەڕ)ە و لـەپاش لێكدان، لەگەڵ بـەركاری ڕاسـتەوخۆ، شـەبەنگی كـارێكی (تێنەپـەڕ) دەپۆشـێت، چـونكە بەركارەكەی خۆی لەواتاگۆڕكێدا خەرجكردوە و ئیدی چۆن بەركارێكی تر وەربگرێت.
- مـەرج نیـە هـەر كۆڵكەیـەكی (بـەركار) بتوانێـت (كـاری لێكـدراو) دروسـت بكـات. لـە ڕاسـتیدا، هەنـدێك لـە كـارە تێپـەڕەكان (كـردن، دان، خـواردن، بـردن، ...) ئـەو بزاڤـە دەگێڕن و واتای تازە دادەهێنن، چونكە مەرجی كاری لێكـدراو بریتیـە لـە (واتـاگۆڕین) و هـەر كاتێـك ئـەو بزاڤـە نەچەسـپێت، ئـەوا كۆڵكـەی (بـەركار) هـەر لـە بزاڤـی ڕستەسازیدایەو بەس.
- بە بەراورد لە گەڵ زمانانی (عەرەبی، ئینگلیزی، فەرەنسی)دا، مـژاری (كـاری لێكـدراو) سیمای مۆركایـەتی پیشـان دەدات بـە تایبـەتی لـە ئـەو كارانـەدا كە وشـەی بیـانی، بـە ڕاستەوخۆیی هەرس دەكەن و دەی كوردێنن.



منتدى إقرأ الثقافي

بە ڕاستی زمانەکەمان خۆی جودا دەکاتەوە لە زمانە خزمەتکراوەکان بە ئەو مۆرکەی کە ئاستی (ڕستەسازی) زۆر حەزی لە بەکارهێنانی کۆلکەی (بەرکار)ە، چی لە وشەڕۆناندا و چی لە واتاسازیدا. هەر لە بەر ئەو سەدەمە، پێویستە تەوەری توێژینەوە و ناوەندی توێژینەوەی لە سەر دابمەزرێت، چونکە بابەتەکە ئەوەندە خۆمانە و خۆماڵیە شایستەی ئەوەیە کە بایەخی تەواوی پێ بدرێت.



منتدى إقرأ الثقافي

**سەرچاوە:**


- دكتۆر شێركۆ بابان، ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ەوە)، هەولێر/ ٢٠٠١.
- دكتۆر شێركۆ بابان، واتاسازی لە پاشگری (ەوە)دا، ڕۆشنبیری كوردستانی ژمارە (١)، هەولێر ١٩٩٩ .
- دكتۆر شێركۆ بابان، گەشتێك بەنێو واتای كاری سووتاندا، ڕۆشنبیری كوردستانی، ژمارە (٢)، هولێر/ ٢٠٠٠ .
- عبدالله عزیز محمد. گۆڕانی واتای وشە لە زمانی كوردیدا. نامەی ماستەر، زانكۆی سەلاحەددین هەولێر/ ١٩٩٠
- د. فتاح مامە، ئێدیۆم لە زمانی كوردیدا، نامەی دكتۆرا، زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر/ ١٩٩٨ .
- د. طالب علي حسين. هەندێك لایەن پەیوەندی نێوان ڕستە و واتا لە كوردیدا، نامەی دكتۆڕا، زانكۆی سەلاحەددین. هەولێر ١٩٩٨ .
- د. یوسف شریف، كاری لێكدراو لە كوردی و فارسیدا، لێكۆڵینەوەیەكی بەراوردكاری، زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر/ ١٩٩٨ .
- شێخ محمد خاڵ، پێشگر و پاشگر، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی دوەم، بەشی یەكەم، بەغدا/ ١٩٧٤ .
- عبدالله شاڵی، ڕابەری قوتابیان بۆ چاوگ و بۆ فەرمان، بەغدا/ ١٩٧٦ .
- د. نەسرین فەخری، چاوگی بێ واتا لە زمانی كوردیدا، بەغدا/ ١٩٧٣.
- د. نەسرین فەخری، پاشگر و پێشگری (ڤە ـ یان ـ وە) لە زمانی كوردیدا، گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد، بەرگی یەكەم، بەشی یەكەم، بەغدا/ ١٩٧٣ .
- د. نەسرین فەخری د. كوردستان موكریانی.
- نووری عەلی ئەمین، گرتنی كەلێنێكی تر لە زمانی كوردیدا، بەغدا/ ١٩٥٨ .
- د. محمد مەعرووف فەتاح، زمانەوانی، زانكۆی سەلاحەددین، هەولێر/ ١٩٨٧ .
- احمد مختار عمر، علم الدلالة، مكتبة العروبة ١٩٨٢.




منتدى إقرأ الثقافي

- د. ن. چۆمسكی، جوانب من نظرية النحو، ترجمة مرتضى جواد باقي، جامعة البصرة ١٩٨٥ .

- د. على زوين، منهج البحث العلمي بين التراث و علم اللغة، بغداد ١٩٨٦ .

- مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەكی ڕێزمانی كوردی، كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا ١٩٧٦ .

- مەسعوود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە، بەغدا/ ١٩٨٨ .

- مەسعوود محەمەد، وردبوونەوە لە چەند باسێكی ڕێزمانی، كۆڕی زانیاری كورد، بەغدا/ ١٩٧٤ .

- ڕەئووف ئەحمەد ئالانی، كێشەیەك لە ڕێزمانی كوردیدا، بەغدا/ ١٩٨١ .

- ئیبراهیم ئەحمەدی، فەرهەنگی كینایە، زانكۆی كوردستان، سنە ١٣٨٦.

- جەلال مەحموود عەلی، ئیدیۆم لە زمانی كوردیدا، بەرگی سێیەم، سلێمانی ٢٠١٠.

- Bescherelle. Le nouveau. L' Art de Conjuguer. Dictionnaire de 12000 verbes. Hatier. Paris 1980.

- V. Cook & M. Newson. Chomsky's Universal Grammar. Blackwell Publishing. 2007.

- J. Hurford & B. Housley. Semantics: a coursebook. Cambridge University Press. 1996.

- F. Katamba. Morphology. Macmillan press 1993.

- R. Leiber. Introducng Morphology. Cambridge University Press. 2012.

- Paris 1995.. Hatier. 6000 Verbes Anglais.G. Quenelle & D. Hourquin

M. Swan & F. Houdart. Pratique de l'Anglais de A a Z. Hatier. Paris 1983. -

- M. Tallerman. Understanding Syntax. 3rd edition. Hodder Education 2011.



منتدى إقرأ الثقافي

## كتێبە بڵاوكراوەكانی نووسەر

١- ڕستە سازی و شیتەڵكاری زانستی، هەولێر ١٩٩٦

٢- میكانیزمە بنەڕەتیەكانی ڕستەسازی، ڕێزمانی بوون و هەبوون، هەولێر ١٩٩٧

٣- دینامیزمی جێناوی لكاو لە ڕستەسازیدا، هەولێر ١٩٩٧

٤- نەخشەی ڕۆنانی ڕێژەی كار، هەولێر ١٩٩٩

٥- لە مۆركە ڕەسەنەكانی ڕێزمانی كوردی ، هەولێر ٢٠٠٠

٦- بەرەو ڕێزمانی كوردی، بەرەو زمانی نووسین، هەولێر ٢٠٠٠

٧- شرۆڤەكاری ڕێزمانی لە زمانی نووسیندا، هەولێر ٢٠٠٠

٨- ڕێزمانی پاشگری دووپاتی (ـەوە) ، هەولێر ٢٠٠١

٩- ڕێزمانی كەسی سێیەمی تاك، هەولێر ٢٠٠٤

١٠- دەنگسازی و بڕگەسازی لە ڕێزمانی كوردیدا، هەولێر ٢٠٠٥

١١- مۆرفیمی ئێستایی (ـە) ، هەولێر ٢٠٠٦

١٢- زمانی نووسینی ڕێزماندار، هەولێر ٢٠٠٨

١٣- بەرەو وشەرۆنان لە زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٨

١٤- هەندێك لە ئاكارە ڕەنگینەكانی ڕێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠٠٨

١٥- ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی لە ئاستی زمانی نووسیندا ، هەولێر ٢٠٠٩

١٦- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠٠٩ ( نووسینەوەی یەكەم)

The Phonemic Junction Faculty

١٧- بەرەو زانستی دەنگسازی لە ئاخاوتنی كوردییەوە، سلێمانی ٢٠١٠

١٨- بـــە زمـــانی ئنگلیـــزی، هـــەولێر ٢٠١٠، (نووســـینەوەی دوەم، پێداچـــوونەوە و نوژەنكردنەوە)

2nd edition.The Phonemic Junction Faculty

١٩- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٠

Engineering Phonology



منتدى إقرأ الثقافي

٢٠- سێ میكانیزمی ڕێزمانی، دەزگای موكریانی، هەولێر ٢٠١٢

٢١- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣

Vowel Power Theory

٢٢- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٣

Phonetic Engineering

٢٣- ڕێزمانی كاری ناسادە، هەولێر ٢٠١٤

٢٤- بەرەو ڕێزمانی ئاوەڵناو، هەولێر ٢٠١٤

٢٥- دەنگسازی زمانی كوردی بە تیۆری زەبری بزوێن، هەولێر ٢٠١٤

٢٦- بنچینەی ڕێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠١٤

٢٧- بڕگەسازیی كوردی لە تیۆری زەبری بزوێندا، هەولێر ٢٠١٤

٢٨- بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٤

Syllabification and Re-syllabification Processes

٢٩- ڕستەسازی و شیتەڵكاری زانستی/ نووسینەوەی دوەم / هەولێر ٢٠١٥

٣٠ - بە زمانی ئنگلیزی، هەولێر ٢٠١٥

Minimized Phonology and Phonetic System Insertion

٣١- ڕێزمانی بوون و هەبوون لە شرۆڤەكاری زانستیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٢ بنچینەی دەنگسازی لە زمانی كوردیدا/ هەولێر ٢٠١٥

٣٣ پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ـە)، هەولێر ٢٠١٥

٣٤- زمانی كوردی لە تەرازووی بەراوردا، هەولێر ٢٠١٥

٣٥- چەند وانەیەك لە ڕێزمانی كوردیدا، هەولێر ٢٠١٥

**٣٦- پانۆرامایەك بۆ ڕێزمانی جێناو، هەولێر ٢٠١٥.**

**٣٧ - گەشتێك بە نێو ڕێزمانی كاردا، هەولێر ٢٠١٦**

٣٨- گەشتێك بە نێو ڕێزمانی بوون و هەبووندا، هەولێر ٢٠١٦.

٣٩- گەشتێك بە نێو ئامرازەكانی ڕێزمانی كوردیدا، هەولێر ٢٠١٦

**٤٠- سێ مۆركی ڕێزمانی كوردی، هەولێر ٢٠١٦.**



منتدى إقرأ الثقافي

٤١- دەنگسازی زمانی کوردی لە پێشفەچووندا، هەولێر ٢٠١٦.
٤٢- چەند بابەتێکی ناوازە لە ڕێزمانی کوردیدا، هەولێر ٢٠١٦،
٤٣- گەشتێك بە کرۆکی ڕێزمانی کوردیدا، هەولێر ٢٠١٦.
٤٤- رووماڵێك بۆ ڕێزمانی ئامرازی پەیوەندی (ـە) لە زمانی نووسیندا، هەرولێر، ٢٠١٧.
٤٥- سەرەتایەك لە واتاسازی لە ڕێزمانی کاردا، هەولێر ٢٠١٧، (ئەم کتێبەی بەردەست).



منتدى إقرأ الثقافي

| واتای بەردەوام بوون لە (سووتان) | واتای وەستان لە (سووتان) |
|---|---|
| گڵۆپەکە دەسووتێت | گڵۆپەکە سووتا |
| گڵۆپەکە دەسووتا | گڵۆپەکە سووتابوو |
| | گڵۆپەکە سووتاوە |

کاریگەری پێشگری بەردەوامی (دە) لە سەر واتای کاری (سووتان)

MINARA PRINTING PRESS
چاپخانەی منارە - هەولێر

منتدى إقرأ الثقافي